

# سامی عەوڵا



١٩١٠ - ١٩٨٥

کۆکردنەوە و پێشەکی و لێکۆڵینەوە و ساغ کردنەوەی

د. کەمال مەعروف

# دیوانی سامی عەودالْ

کۆکردنەوە و پێشەکی و  لێکۆڵینەوە و ساغکردنەوەی

د. کەمال مەعروف

٢٠١٠

سلێمانی

# دیوانی سامی عەودالْ


- ئامادەکردنی: د. کەمال مەعروف
- بابەت: شیعر
- پیتچنی: نووسەر
- هەڵەچنی: عەتا مەحمود
- نەخشەسازیی بەرگ: نووسەر
- نەخشەسازیی ناوەوە: نەوروز جەمال
- سەرپەرشتیاری کتێب: کارزان عەبدوڵا
- زنجیرەی گشتی کتێب: (٧١١)
- تیراژ: (٧٥٠ ) دانە
- چاپ: چاپخانەی کارۆ
- نرخ: (٦٠٠٠ ) دینار
- ژمارەی سپاردنی (١٢١٦)ی ساڵی ٢٠١٠ی وەزارەتی رۆشنبیریی دراوەتێ.

بەڕێوەبەرێتی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی
گردی ئەندازیاران - بەرامبەر کوردستانی نوێ
ژمارەی تەلەفۆن: ٣١٨٠٩٩٤

# پێشەکی

ئەوی راستی بێ بیرۆکەی کۆکردنەوەی شیعرەکانی سامی عەودالّ بۆ حەفتاکان دەگەڕێتەوە، کەفێرخوازی زانکۆ بووم لە سالاّنی حەفتاکاندا، رۆژانە سەردانی دوکانی سامی عەودالّی شاعیرم دەکرد، دیارە دوکانەکەی شوێنی کۆبوونەوەی شاعیران و رۆشنبیرانی شارەکە بوو، کە لەلای سامی شاعیر دادەنیشتم یەکسەر شیعرە تازەکانی بۆ دەخوێندمەوە، منیش لەلای خۆمەوە تۆمارم دەکردن، زۆرجاریش دەسنووسەکانم لێ وەردەگرتن، لە مالّەوە دەمنووسینەوە، ئارەزووم دەکرد کە شیعرەکان بەچاپ بگەیەنم، بەلاّم بواری چاپەمەنی ئەوکات وەکو پێویست لەبار نەبوو کە بەدلّی خۆت هەموو شیعرەکان بە چاپ بگەیەنی، لە سالّی ١٩٧٦ کاتێ بەشێك لە شیعرەکانی رۆستەم حەویزم ئامادەکرد بۆ چاپ، سانسۆر بەشێکی زۆری شیعرەکانی قرتاندبوو، و خەتی سوری بەزۆر هێنا بوو لەگەلّ ئەوەشدا چونکە یەکەم بەرهەمم بوو بەچاپم گەیاند، هەرچەندە بەدلّی خۆم دەرنەچوو، بۆیە بڕیارمدا شیعرەکانی سامی عەودالّ دوابخەم تاکو دەرفەتێ هەلّدەکەوێ و بێ سانسۆر بتوانم هەمووی بخەمە روو، لەسەرەتای سالّی ٢٠٠٨دا جارێکی تر بەپرۆژەکەی سامی عەودالّدا چوومەوە، لەگەلّ هاورێی دێرینم ئازاد مەلا عەلی چووینە مالّی کوڕەکەی سامی عەودالّ کە لەگەڕەکی بایزغای دەژیا تاکو دەستنووسەکانی لێ وەربگرم، مەلا زاهیر کوڕی سامی عەودالّ زۆر بەخۆشحالّییەوە دەستنووسەکانی باوکی خستە بەردەستم، هەرچەندە وتی بەخوا چاپکردنی بەچاوی خۆم نابینم و دەمرم. قسەکەی مەلا زاهیر راست دەرچوو، چونکە نەخۆشی دلّی هەبوو، بۆیە لە ٢٠٠٩ کۆچی دوایی کرد، بەلاّم بەر لە کۆچکردنی رۆژێك لە فولکەی حاجی قادری کۆیی چاوم پێی کەوت هەوالّی ئەوەم پێ ڕاگەیاند کە هەموو شیعرەکان کۆمپیوتەر کراون و بەم زووانە چاپ دەکرێن، بەم هەوالّە وەکو گولّ گەشایەوە.

دەستنووسەکانی سامی عەودالّی شاعیرم چەند جارێك خوێندەوە و شیعرەکانم لەگەلّ دەستنووسەکانی لای خۆم بەراوردکردن، پاش ماندووبوونێکی زیاتر لە دووسالاّن، توانیم شیعرەکان تاڕادەیەکی باش ساغ بکەمەوە، شیعرەکانی ئەم دیوانە کە کۆکراونەتەوە هەموو شیعرەکانی شاعیری بەخۆ گرتوون، تەنیا هەندێ لە چوارین و شیعرە هزرییەکانی شاعیر نەبن، کە گولبژێرم کردوون، هەندێ شیعری لاواز و هەندێ دەستەواژە و وشەی دزێوم فەرامۆش

کردوون، کە بۆ بڵاوکردنەوە ناشێن. ساغکردنەوە و نووسینەوەی شیعرەکانی سامی عەودالْ کارێکی ئاسان نەبوو، چونکە خەتەکەی خالّە سامی زۆر کۆن‌و ناخۆش بوو، بەڵام دوای هەوڵ‌و کۆششێکی بێ وچان توانیم بگەمە ئەنجامێکی باش.

بەئەمانەتەوە دەمەوێ بە خوێنەران ڕابگەیەنم کە شیعرەکان بەهیچ شێوەیەك تەنانەت وشەیەکیش دەسکاری نەکراون، بەڵام ئەگەر هەستم کردبێ لە شوێنێك لەنگییەك هەبووبێ، ڕتووشێکی بچووکم بۆکردووە، بۆ ئەوەی خەوشی شیعرەکە نەمێنێ، بەڕاستی زۆرم بەلاوە سەیر بوو کە چەپکێ لە شیعرەکانی سامی عەودالّم خوێندەوە لە هەندێ شوێندا وشە و دەستەواژە و ڕستە یارییان پێ کراون، کە لەگەڵ دەستنووسەکانی شاعیردا یەکیان نەدەگرتەوە.

بەشێوەیەکی گشتی مورکی نیشتمان پەروەری بە شیعرەکانەوە دیارە، شاعیر ئازار و نەهامەتی میللەتەکەی، نەبوونی کیانی سیاسی، هۆکارەکانی خستۆتە ڕوو و شۆڕشگێڕانە چارەسەری برینەکانی کردوون، شاعیر لەو بڕوایەدایە کە داگیرکەران بەسانایی ملکەچی داوای ڕەوای نەتەوەکەی نابن تاکو خەباتێکی خوێناوی بەردەوام لە پێناوی ئازادیدا بەرپا نەکرێ، بەزمانێکی کوردی ساکار و سادە و بەکێشێکی خۆماڵی بابەتەکانی دەربڕیوون، لەکۆتاییدا ساغکردنەوە و کۆکردنەوەی شیعرەکانی سامی عەودالْ بۆ پەرەپێدانی مێژوو و ئەدەبی کوردی کارێکی گرنگ و پێویست بوو، بەهیوام کە توانیبێتم خزمەتێکی بچکۆلانە پێشکەش گەلەکەم بکەم و شیعرەکانی شاعیر لە فەوتان و لەناوچوون ڕزگاربکەم و خەرمانی ئەدەبی کوردیم پێ زەنگین و ڕەنگین کردبێ.

# ژیان و بەسەرهاتی شاعیر

سامی عەودال:[١] ناوی حوسەینە، کوڕی بابە ڕەسوڵە، ساڵی ١٩١٠ لە شاری کۆیە هاتۆتە دنیاوە، سامی خۆشی دەڵێت:

لەنۆسـەت و نەی بـووم لـەداکی خـۆم
لـەناو شـاری کۆیـە بۆیـە خـەڵقی کـۆم
بـەڵام دانیـشتووی شـاری هـەولێرم
لەوێـدا دەژیـم لەسـەر ڕەنجـی خـۆم

لەناو خێزانێکی هەژار و فەقیر گەورە بووە، هەر لە تەمەنی چوارساڵیدا خراوەتە بەر خوێندن، لەلای مامی مەلا محیەدین لە تەکییەی خۆیان سیپارەی خوێندووە، وە هەر لە تەکییەی خۆیان لە لایەن مەلا ئەحمەد شنۆیی وانەی ئایینی خوێندووە، لە تەمەنی حەوت ساڵیدا باوکی کۆچی دوایی کردووە، دایکی کە ناوی گوڵێ بووە، بە هەتیووی بە ساوەر هاڕین و تەشی ڕێسان و کورەی حەمام سووتاندن بەخێوی کردووە.

سامی دەڵێت: هەرچەندە دایکم مێردی بە مامم خەلیفە نەجمەدین کردەوە، کە بەخێومان بکات، گوایە مامە و واریسە کە حەقی بەخێوکردنی لەسەرە، کەچی بەخۆی و کوڕێکی کە ناوی سەدرە، دایکی هەژارم ئەویشی بەملدا هات، کە بەخێویان بکاو بەخێویشی کردن، لە تەمەنی نۆ ساڵیدا لەبەر کەوش دروویان داناوە، بەشەو مامی مەلا محیەدین دەرسی پێ وتووە، کەمامیشی مرد بە ڕۆژ خەریکی کەوش دروویی بووە، بەشەویش لەلای مام حەمەدەمین حاجی کتابە فارسییەکانی خوێندووە، زۆر حەزی لە خوێندنەوەی شانامەکان بووە، پاش ئەوەی فێری

---

[١] سامی عەودال: شاعیر ئەم ناوەی لە(سامی) کوڕی نەریمان وەرگرتووە کەپاڵەوانێکی ئەفسانەیی کورد بووە، عەودال، لەقەبی بنەماڵەکەیەتی کە گوندی عەودالانی دروست کردووە، زۆر عەودالی ئاین بوونە.

کەوش درووبی دەبێ، کەوش درووبی بەسەر دەچێ، دەست بە قوڕکاری وکەتیەکردن دەکا لە ساڵی ١٩٣٥ بۆ کەتیە کردن لەگەڵ تۆفیق وردی شاعیر چونەتە ناوچەی سیکەنە وسەرخان کە دەکەوێتە نێوان سنووری عێراق و ئێران، شوێنێکی شاخاوی زۆر خۆش و سەرنج ڕاکێش بووە، شاعیر ئەم دیمەنە ڕەنگین و جوانە دەبینێ و کاردەکاتە سەر هەست و ئەندێشەی و دەڵێت:

بـــەبیرت نایـــێ ســـاڵی کـــەتیران
لەشـــاخی نێـــوان عێـــراق و ئێـــران
لـــەناو کۆچـــەری مـــەنگوڕ و ئـــاکۆ
هەنـــدێ جـــار لـــەناو مـــامش و پـــیران

لەهەمان ساڵدا بۆ کەتیەکردن چۆتە چیای هەڵگوش کە دەکەوێتە نێوان سنووری عێراق و تورکیا، بە دەیان کانی و کانیاوی سازگار و باغ و باغاتێکی یەکجار بەتام و بەلەزەتی هەیە. بۆیە شاعیر دەڵێت:-

چـــەند خۆشـــە لـــە هەڵگۆشـــی
دانیـــشی بـــەدڵ خۆشـــی
تەماشـــای شـــاخ و کـــانی
کابـــانی مـــەڕ دەدۆشـــی

پاشان خەریکی پینەدۆزی دەبێ، هەتا جەنگی دووەمی جیهانی، لەدواییدا لەتەقتەق چایخانەی داناوە، حاڵی زۆر خۆش بووە.

سامی دەڵێت: دایکم زۆر حەزی دەکرد کە هەر بخوێنم، بەشەو دەمخوێند لەلای مەلا عومەری سۆفی رەشید کەزاواشمان بوو لەکۆیەش هەر لەکنیم خوێندبوو، لەتەقتەقیش لەناوەڕاستی جەنگی هیتلەر مامۆستام مەلا عومەر وتی هەردەبێ بچین بۆ توتنەوانی منیش لەبەرئەوەی مامۆستام بوو دڵم نەشکاند بوومە توتنەوان، بەم شێوەیە لە ساڵی ١٩٤٤ لەگەڵ

مەلا عومەر سۆفی ڕەشید چوونەتە گوندی بازمۆس لەبیتوێنێ، بەم بۆنەیەوە ئەم هۆنراوەی داناوە، کە دەڵێت:

خـــــــۆمو بــــــــەخت و ناوچـــــــەوان
ســـــــاڵێ بوومـــــــــە توتنـــــــــەوان
بارمـــــــان کـــــــرد بـــــــۆ بیتوێنــــــێ
یـــــــاخوا کـــــــافر نـــــــەیبینێ

سامی لەبەر هەژاری و نەبوونی و نەهامەتی و کەساسی بە ناچاری ساڵی ١٩٥٠ کۆیە بەجێ دێڵێ و بەرە و هەولێر دەچێ، بۆیە دەڵێت:

مـــن فـــەقیر و دڵ حـــەزینم بـــۆ هـــەژاریم خـــەم دەخـــۆم
ڕووت و برســـی و دەردەدارم ســـاڵی جـــارێ خـــۆم دەشـــۆم

لەکۆتایی هۆنراوەکەیدا دەڵێت:-

هەژار و دەردەداری تاکەی دەنۆشی ســـامی
تۆ فەقیر و بێ مەکانی قەت مەڵێ من خەڵقی کۆم

ساڵی ١٩٧٢ جارێکی تر بەرەو شاری دێرینی کۆیە دەگەڕێتەوە و دەڵێت:-

بەهاری کۆچ ڕەنگینە چیا و سەحرای هەموو شینە
بەڕەیحان و بەنەسرینە هەژاری بۆچی غەمگینە
بەهاری بەزم و سەیرانە لەباغان خونچە خەندانە
لەوێ بولبول غەزەل خوانە کەسامی مات و حەیرانە

## لەڕووی بابەتی شیعرییەوە:

ئەگەر سەیری سەرجەم شیعرەکانی شاعیر بکەین، دەبینین لەهەموو بابەتەکانی شیعرییدا هۆنراوەی هۆنیوەتەوە، لەشیعری دڵداری، کۆمەڵایەتی، سیاسی، بەرەنگاری، فەلسەفی، ئاینی، پەند و ئامۆژگاری، باخچەیەکی بەپیتزی شیعری بۆ بەجێهێشتووین کە خەرمانی شیعری کلاسیکی کوردی و نوێخوازی زەنگین و ڕەنگین کردووە، خشتێکی خستۆتە سەر قەڵای ئەدەبیاتی کوردی، لە شیعرەکانیدا ئاستی جیاواز بەدی دەکرێن، شاعیر هەنگاو بەهەنگاو بەرەو پێش چووە، توانیویەتی دەنگ و ڕەنگی خۆی وەکو شاعیرێك پێشان بدات:

### ١- شیعری دڵداری:

ئەوەی لە شیعرە دڵدارییەکانی سامی بەدەردەکەوێ، شاعیر هەروەکو شاعیرە کلاسیکییەکانی کوردی هەست و سۆزی خۆی دەربڕیوە بۆ پێشاندانی توانای شاعیرێتی خۆی، دیارە لەپاڵ ئەو هەست و سۆزەدا، شاعیر وەسفێکی قەشەنگی یارەکەی کردووە، جا ئەم وەسفکردنە لاسایی کردنەوەبێ، یاخود بەهۆی کاریگەری ئەدەبیاتی فارسی و عەرەبییەوە بێ لە بەرهەمەکانیدا ڕەنگیان داونەتەوە. شاعیر لەهەرەتی لاوێتیدا هەستی بێگەردی خۆی بەرامبەر کیژێ دەربڕیوە، شاعیر سەودا و ئەڤینی شۆخێ بووە، بەجۆرە گوزارشتی لێ کردووە.

ببینی وەسفی ناتانی عەجائیب نەوجەوانێکە
کەمەر شل پەنجە شمشاد و چ شۆخ و سینەپانێکە
کەداوی عەنبەری خاوی دەشێوێنێ نەسیمی دەم
وەکو جەیشی فەرەنگ و ڕۆم لەڕووی یارا هەڕانێکە

سامی عەودالّ لەشیعری دلّداریدا، بەشێوەیەك بەیارەكەی هەلّـداوە، كەهەسـت وسـۆزی هەموو خاوەن دلّێك دەخورپێنێ:

كراسـەكەی كتانـە سـوخمە لەسـەر مـەمانی
چـاو ڕەشـی بـرۆ كەمانـە عەباكـەی توركمـانی
شـەمالّ پێـچەی هەلّـداوە كـەزی لـەملان ئـالاوە
دلّـم بـۆ تـۆ نـەماوە بـۆ حـالّی مـن نـازانی

• شاعیر سكالای دلّی بریندای خۆی بەرامبەر یارە بێ وەفا و بێ ڕەحمەكەی دەردەبڕێ، كـە چەند لەگەلّی بێ وەفایە هەرجارێك ئاوڕێكی لێ ناداتەوە:

هـــەتا كـــەی ڕوومـــان تـــێ ناكـــا
بـــێ دینـــە ڕەحمـــم پـــێ ناكـــا
لـــەزار و شـــینی لـــەمیلاوە
جـــارێكی ڕوومـــان تـــێ ناكـــا

## ٢- شیعری سیاسی:

بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی كورد بەدرێـژایی مێـژوو لەهەلّـچوون و داچـوون دابـووە، ڕووداو كارەساتە مێژووییەكان كاری زۆریان كردۆتە سەر هەست و نەستی شاعیرانی كورد، شاعیرانی كوردیش بێ دەنگ نەبوونە بەلّكو هەلّوێستیان بەرامبەر وەرگرتووە، بەشیعر نـاڕەزایی خۆیـان خستۆتەڕوو، ڕۆلّێكی كاریگەریان بینیوە لەئاراستەكردنی لاوان و شۆڕشـگێران بـۆ خـەبات و تێكۆشان و بەرگریكردن لەخاك و نەتەوەدا، گیانی بەرەنگاری و هزری شۆڕشـگێرییان لـەدلّ و دەروونـی خـەلّكی كوردسـتان بەرقـەرار كـردووە، شـیعرە سیاسـییەكانی سـامی عـەودالّ بەزمانێكی ڕوون و ئاشكرا نووسراون، خەلّكی بەئاسانی لێیـان تێـدەگات، هەسـت بـەئێش و ئازارەكانیان دەكەن، لەم شیعرە سیاسیانەدا شاعیر زیاتر بایەخ بەلایەنی هزری دەدات، چـونكە

زیاتر مەبەستی هۆشیارکردنەوە و ئاگادارکردنەوەیە لە بارودۆخی سیاسی کوردستان، بۆیە لەهۆنراوەی (نەورۆز)دا دەڵێت:-

سەربلندکە ئەی لاوی کورد چاو هەڵێنە بیرکەوە
میللەتی دیل و هەژاری ڕو لەگریان ژیرکەوە
پێی لەکۆتی بەندیخانە و هێشی ناو زنجیرکەوە
کوردە ئیمڕۆ ڕۆژی شادیت موژدەبێ ڕۆژی نەوە
هەستە ئالأی شێر نیشانی زەردوسورت هەڵکەوە

شاعیر داوا لەکیژانی کوردستان دەکات کە ڕێگای خەباتی سیاسی و تێکۆشان بگرنە بەر، تاکو بەمافەکانیان شاد دەبن:

بە چاوی تیژ و بە دڵی پاکت
بە تێکۆشان و بیری ڕۆناکت
سەرت بڵند کە ئەی کچی زانا
بنۆڕە شاخ و سامانی خاکت

ڕاستگۆیی و هەڵوێستی جوامێرانەی لە شیعرە سیاسیەکانی بەدەردەکەون کەزۆر بوێرانە داکۆکی لەمافی ڕەوای گەلەکەی بەتایبەتی چینی چەوساوەکان دەکات و داوایان لێ دەکات کە یەکگرتووبن. دەڵێت:

جەژنەیە جەژنی گشتی کارگەران
لەناو کارخانە و دنیای هەندەران
وا یەکدی گرن یەك بیروبڕوا
لە جەرگەی گەل و جێگای کارگەران

## ٣- شیعری بەرەنگاری:

ئەم جۆرە شیعرە ڕۆڵی گرنگ دەگێڕێ لە بەرگریکردن لە خاك و نەتەوە کـە داگیرکـەران هەوڵی سڕینەوەی دەدەن، شاعیر زۆر بەتوندی بەرەنگاری ناحەزانی میللەتەکەی ڕادەوەستێ لـە مەرام و پیلانی داگیرکەران خەڵکی هۆشیار دەکاتەوە، کە دەیانـەوێ ڕەسـەنایەتی نەتەوەکـەی نەهێڵن و لەناویبەرن، بۆیـە دەبیـنین شـاعیر وەکـو دەنگێکـی شۆڕشـگێڕ و کۆڵنـەدەر دێتـە مەیدانەوە، هاواری لێ هەڵدەستێ، مژدەی ئازادی و سەرفیرازی ڕادەگەیەنێ، میللەتەکەی بەرەو خەباتی چەکداری دەوروژێنێ و هانیان دەدات کە درێژە بە خەبات بدەن تاکو سەرکەتوو دەبـن، بەتایبەتی لە هۆنراوەی ( قەلبی من) کە بۆتە وێردی سەرزاری خەڵکی کوردستان:-

قـــەلبی مـــن گـــەر چەشـــنی لالـــە بێـــت و نـــەوتی تێبکـــەن
ئـــاگری دوژمـــن بێتـــە گیـــانم وەك چـــرا مـــن پێبکـــەن
شەقـشەقی کـەن گۆشـت و یەسـقان یـەك بەیـەك خێـی تـێ بکـەن
بـــێ تـــرس مـــن دێمـــە مەیـــدان حوکمـــە ئـــازادیم دەوێ
گـــەر نەســـوتێم و نـــەخنکێم چـــۆن هـــەژارم ســـەرکەوێ

شاعیر لە شیعرە شۆڕشـگێرییەکانیدا، هـەڵگری بیروبـڕوای پێـشکەوتنخوازییە، لەبـەر ڕۆشنایی ئەم بیروباوەڕەدا ڕێڕەوی خەبات و تێکۆشانی کورد دەستنیشان دەکات، شـاعیر بـڕوای تەواوی بە خەباتی چەکدارییە و بـە تاکـە ڕێگـای سـەرکەوتنی دەزانـێ، پێـی وایـە بـە بـێ خوێنڕشتن هەرگیز میللەتان بە ئاواتەکانیان ناگەن، دوژمنەکانیشیان وا بە ئاسانی داواکانیان جێبەجێناکەن.

هـــەر خـــوێن ڕەواجـــە ئـــازادی بکـــڕێ
مـــردن بـــۆ دوژمـــن کفـــنی بـــۆ بـــبڕێ
خوێنـــە خەنجـــەر و ورگـــی پـــێ بـــدڕێ
هـــەر خـــوێن و هێـــزە ژیـــانی جیهانـــێ

شاعیر بێ پەروا جەخت لەسەر خەباتی خوێناوی دەکاتەوە بە تاکە جەمسەری ئازادی و سەربەستی دەزانێ:

خوێنی سووری لاوی ژێرە بۆ شەهادەی مێژوونووس
بۆت دەنووسێ و دێتە دەفتەر خوێن و قەدر و قیمەتت
خوێنە شاعیر نامەکەت بابچێتە ناو ئەمن و ئومم
ببتە شاهید بۆ نیشانە، پایەداری شەوکەتت

شاعیر لەو بڕوایەدایە کە لە جیهانی سێیەمدا، ئاستەمە ئازادی و ئارامی نێوان گەلان بێتە ئاراوە، بەبێ خەبات و تێکۆشانی چەکداری، بۆیە دەڵێت:

هێمنایم دەوێ هێمنایم دەوێ
گەلێکمان نەدیت وە هاسەرکەوێ
دەست نەکاتەوە و زۆر ئازا نەبێ
دەبێ وەکو خاك لە بن پێ کەوێ

سامی وەکو شاعیرێکی چەپ، لەو بڕوایەدایە کە گەلە چەوساوەکان لەهەر شوێنێکی دنیا بن، برای یەکن خەبات و تێکۆشانیان زنجیرەیەکی نەپچڕاوە لە خەباتی هاوبەش سەرکەوتنی هەر لایەکیان، سەرکەوتنە بۆ ئەویتر، چونکە دوژمنیان هاوبەشە، بۆیە دەڵێت: -

ئێمە کە کوردین لەگەڵ براکان
هەژاری هیندی و ئەنگلۆ ئەمریکان
غایەمان یەکە و خەباتیش بە پێ
بەیەك عائیلە ئەدیترێن بە پێ

## ٤- شیعری نیشتیمانی:

خۆشەویستی خاك و نەتەوە، هەستێکە لـە بیروبـاوەڕێکی قـووڵی نەتەوەییـەوە سەرچـاوە دەگرێ، بۆیە ناتوانرێت نیشتمان و نەتەوە لێکتر جودا بکرێنـەوە، بـەڵکو تەواوکـەری یـەکترن کەواتە بیروباوەڕی نەتەوایەتی لەسـەرووی هـەموو شـتێکەوە دێـت، بـۆ جۆشـدانی سـەرجەم مرۆڤایەتی لە خۆشەویستی نیشتیماندا و قوربانیدان و وەلاوەنانی بەرژەوەندییەکان لەپێناویدا. هەموو میللەتانی دنیا خاوەنی خاك و زێدی خۆیانن و هەمیشە شانازی و بەرگری لێ دەکـەن، نەتەوەی کوردیش وەکو هەموو نەتەوەکانی تری سەر ڕووی زەمین خاوەنی خاك و زێدی خۆیەتی، بەڵام ناحەزانی کورد بە بەردەوامی لە پیلانگێڕاندان بۆئەوەی خاکەکەی پارچە پارچە بکـەن و نەتەوەکەشی لە هەموو مافێکی مرۆڤایەتی بێبەش بکەن تاکو بتوانن سامان و خێـر و بێـری ئەم وڵاتە ڕەنگینە بەتاڵان ببەن، بەڵام میللەتی کورد بە هیچ کلوجـێ لـە خـەبات و ڕاپـەڕین نەوەستاوە و ناوەستێ تاکو بە هەموو ئاواتەکانی شاد دەبێ و داگیرکەران لەکوردستانی ئازیزدا وەدەردەنێ.

خـاکی خۆشـی پـڕ لـە میـوەت بوویتـە گـەو خـوێن و دەمـار
گەوهـــەر و کبریـــت و نـــەوتی قسلوگێـــچی بـــێ ژمـــار
مەڕمـــــەڕ و بـــــەردی حــــەلانی وا لــــەبۆ بێگانەیـــــە
سـێوەرە و وێنجـەی شـلێر بـۆ ئەسـپی ئاغـای پێـچە خـوار

شیعری نیشتیمانی ڕۆڵی کاریگەر دەبینێ لەپێگەیاندن و پەروەردەکردنی مرۆڤی دڵسۆز بۆ خاك و نەتەوە هانیـان دەدا کە زێدەکەیان خۆش بوێ، تۆی ئەڤین و عیشقی نیشتیمان لـە دڵ و دەروونی لاوانی نەتەوەکەی دەچەسپێنێ:

ئـــەی خـــاکی کـــوردی خـــۆش و ڕۆنـــاکم
بـــۆ تـــۆ بـــسوتێم ئـــەمن بـــێ بـــاکم
چـــونکی تـــۆی خـــاکی بـــاب و بـــاپیران
چـــەنگێکە لـــە خـــۆت لاشـــەکەی داکـــم

### ٥- شیعری کۆمەلایەتی:

ئەو شیعرەیە کە دیاردە دزێوەکانی ناو کۆمەڵگای کوردەواری دەخاتە ڕوو، بەتایبەتی زوڵم و زۆرداری، نەخۆشی، هەژاری و نەهامەتی و بێداری، نەخوێندەواری، کێشەی ژنان، کێشەی نێوان جوتیار و دەرەبەگ، شاعیر نارەزایی خۆی بەرامبەر کەموکوڕییەکانی ناو کۆمەڵ دەردەبڕێ و زۆر هەوڵ و کۆشش دەکات، تاکو نەتەوەکەی هۆشیار بینەوە و هەوڵی چارەسەرکردنیان دەدات و ڕێگای زانست و زانیارییان بۆ دەستنیشان دەکات تاکو بەهۆیەوە بەسەر ئاستەنگەکاندا زاڵ بن.

**یاخوا قەت نەژی نەخوێندەواری**
**عالەم دەخاتە برسیەتی و هاری**
**دەبنە دەروێش و یا سۆفی ملپان**
**جا حەملەی دەبەن بۆ سەر بێچاری**

دیاردەی فرەژنی و توندوتیژی دژی ژنان دیاردەیەکی دێرینە و تاکو ئێستاش کۆمەڵگاکەمان پێوەی دەناڵێنێ، جا شاعیر ئەم دیاردە ناشیرینە دەخاتە پێش چاوان بەو هیوایەی کە لە دوارۆژێکی نزیکدا بنبڕبێ:

**دامیان بە یەکێ حەوت ژنی هەیە**
**دائیم خەیاڵی سەرخۆشی هەیە**
**لەسەر حەوت ژنان من دەبم بە هەشت**
**بە زۆری کەیفی هەتیوی هەیە**
**خوا باوکم بگرێ دامی بە دینار**
**دامی بە یەکێك سەرخۆش و زۆردار**

مرۆڤ لە ژیاندا دەبێ بە ئارەقی ناوچەوانی بژێوی ڕۆژانەی خۆی پەیدابکات، بەڵام بەداخەوە مرۆڤی بەدکار و دووڕوو، بەکاری ناڕەوایی نان پەیدادەکات کە کارێکی کۆمەڵایەتی یەکجار ناشیرینە.

بەسیە دوو ڕوەتی مامە دێوانە
بەخوا هاوارت هەر لەبۆ نانە
بڕۆ ناو قوڕێ عارەق بڕێژە
وادەبێ ژیان و ژیانی مەردانە

شاعیر بەتوندی ڕەخنە لە بارەی ناعەدالەتی کۆمەڵایەتییەوە دەگرێ کە هەندێ دەسەڵاتدار دەواڵ پێ لەسەر کۆمەڵگا دەژین ژیانێکی خەیاڵاوی هەندێکی تریش بەهەژاری و نەبوونی ژیان دەبەنە سەر کە نانیان بەدۆ راناگا.

هەندێ کەس برسی و بە بێ کڵاوە
لە برسان سیس و کاڵە دڕاوە،
هەندێکیش تەلار بۆی ڕازاوەتەوە
خواردنی مریشك گۆشت وپڵاوە
لە خەو هەڵدەستێ حەمام حازرە
هەژاریش نیتی پارەی باراشی.

## ٦- شیعری ئاینیی:

خاکی کوردستان پێش هاتنی ئیسلام جێگای ئاینزاکانی تر بووە وەکو ( مەسیحی، یەهودی، یەزیدی، زەردەشتی...هتد ) دوای بڵاوبوونەوەی ئیسلامیش کورد یەکێك بووە لەو میللەتانەی کە بۆتە موسڵمان و بەرگری لە ئاینی ئیسلام کردووە، بە دەیان زانای ناوداری ئاینیی لەناو کورددا هەڵکەتوون، بەشێکی زۆر لە شاعیرانی کورد پەروەردەی حوجرە و مزگەوتن پەیرەوی ئەم ئاینەیان کردووە، ئەم ئاینەش ڕۆڵی گرنگی گێڕاوە لە سەرهەڵدانی شیعری ئاینیدا، مەلا و زانا و شاعیرانی کورد خزمەتێکی بێپایانی ئەم ئاینەیان کردووە، پیرۆزی و باوەڕی ئەم ئاینەش لە دڵ و دەروونی شاعیرانی کورد ڕەنگی داونەتەوە، ئەمەش وای کردووە، کە بەشێك لە شاعیرانی کورد لە ڕێگای شیعرەکانیانەوە بانگەواز بۆ بڵاوکردنەوەی ئاینی ئیسلام بکەن و پیرۆزی ڕوکنەکانی ئاینی ئیسلامیان خستۆتە ڕوو، ئەدەبیاتی کوردی کە لە سەدەکانی ناوەڕاستەوە دەستپێکردووە، بە ئەدەبی ئاینیی و مەزهەبی خەریك بووە، جا شاعیری مەزهەبی و عەقیدەیی هەستی خۆی بەرامبەر بەو هێزەی کە باوەڕی پێیەتی دەربڕیوە:-

بلێ ئەو خوایەی پێویستە بوونی
یەکە و تەنیایە یەعنی بتوونی
هەر ئەو خوایەیە جێی نیاز و ئومێد
کەسی لێ نەبووە و کەسی لێ نابێت
بەهیچ کەس ناچێ بە دەستەڵاتە
کەس بەوی ناچێ صاحیب نەجاتە

سامی شاعیر زۆر بایەخی بە بابەتی ستایشکردن و پیاهەڵدان داوە، لە چەند هۆنراوەیەکدا ستایشی پێغەمبەری کردووە، هەستی خۆشەویستی خۆی بەرامبەر محەمەد (د.خ) دەربڕیوە:

**نایەتە قەڵەم سەروەت و سامانی محەممەد**
**ناگوترێ بەدەم خەڵقەت و یارانی محەممەد**
**دڵە پەروانەی خورشیدی سەیدی سەروەر**
**سەد جار بەفیدای پەرچەم و موژگانی محەممەد**

سامی عەوداڵ لەبەرئەوەی هەر لە منداڵیەوە دەخرێتە بەر خوێندنی حوجرەو مزگەوت بەهۆیەوە فێری خوێندن و نووسین دەبێ، رۆشنبیرییەکی ئایینی باشی لەلا پەیدا دەبێ و لە شیعرەکانیدا ڕەنگ دەدەنەوە و کاریگەری قورئان و حەدیسی زۆر پێوە دیارە.

حەزرەتی موحەمەدولئەمین دەفەرمووێ:

**ئەوا حەدیسی قاتیل و مەقتوول**
**بۆی ئیسپات کردین خوێنرێژی مەسئوول**
**لەوەختێك دا بوو کە فەرمووی تەواو**
**کاتێکمان زانی کە هاتە پێش چاو**
**یاخوا هەر نەژی ئینسانی نەزان**
**بەو پێغەمبەرەی بۆ ئایینی ئیمان**

### ٧- شیعری فەلسەفی:

تێرامان و بیرکردنەوەیەکی قووڵە لە ژیان و گەردوون، لە بوون و نەبوون، فەلسەفە رۆڵێکی گرنگ دەبینێ بە بێ بوونی بۆچوونی فەلسەفیانە لە ژیان و لە واقیعدا هیچ شارستانیەتێك بەرەو هەڵکشان ناچێ، بیری فەلسەفی لەناو شیعر و شاعیرانی کورد دیارە هەر لە بابەتاهیری هەمەدانییەوە تاکو شاعیرانی ئیمڕۆ بەدی دەکرێن، شاعیران و ئەدیبان بیانەوێ و نەیانەوێ، بیری فەلسەفی لە بەرهەمەکانیاندا ڕەنگ دەدەنەوە و هەموو شیعرێك جۆرێك لە پەیامی هەڵگرتووە کە لە بیروبۆچوونی فەلسەفییانە بێ بەش نییە، کەواتە شیعری فەلسەفی هەوڵدان و نزیکبوونەوەیە لە راستی ژیان و دەوروبەردا.

مرۆڤ لە ژیانیدا دەبێ نەهێڵێ فرسەتی لەکیس بچێ، چونکە کە شتێك رۆیشت تازە بەکەس ناگەڕێتەوە...

مردی کە مرد تێ پەڕی بە تۆ زیندی نابتەوە
بیروبڕوای زانیاری بە کەس مەحف نابتەوە
وەکو خاکە بۆ گوڵدان زانا دەیزانی بێ شك
ژینی سوڵتانی سەرە کە کورد پێی دەڵێ مێشك

ڕەزیلی ڕەوشتێکی زۆر دزێوە، ئەوانەی ئالۆچاغن لەناو کۆمەڵدا هەمیشە چاوبرسین و دڵیان نایەتماڵی خۆیان بخۆن، بۆیە لە کوردیدا دەڵێن ماڵی نەخۆری بۆ چەکمە سۆری:

پول پەرست نەبێ پول خڕنابتەوە
چاو بەخۆڵ نەبێ قەت پڕنابتەوە
خاك لسوورك دەدا هەندێ دومبەلان
قۆرت پڕ نابتەوە نەرمی کەندەلان

ئەوکەسانەی کە درۆ دەکەن، زمانیان کورتە خەڵك باوەڕیان پێ ناکەن و لەنێو خەڵکدا سوك و ڕیسوان.

**ئینسانی درۆزن زمانی کورتە**
**سەقیل و چاوتەنگ و بە پرتە پرتە**
**هەتا زەنگین بێ دەڵێ هەژارم**
**وەك مریشکی کورك بە قرتە قرتە**

## ٨- شیعری بۆنەکان:

سامی عەودالڵ شیعرێکی زۆری بۆ بۆنەکان گوتووە وەکو یازدەی ئازار، نەورۆز، یەکی ئایار، جەژنی کرێکارانی جیهان، حیلفی پۆتسدامی ١٩٢٥ بەریتانی، شیعری بۆ پێشەوا قازی محەمەدو بارزانی نەمر گوتووە، شیعری بۆ ژنانی تێکۆشەری وەکو قەدەم خێر و خانزاد و فاتیمە و دەرسیم گوتووە، شیعری بۆ یەکێتی قوتابیان هۆنیوەتەوە و داوایان لێ دەکات کە یەکگرن.

**بە بۆنەی لەناوچوونی هیتلەری فاشی شیعری نووسیوە...**

لە شەڕی دووەمی جیهانیدا کە ئەڵمانیای نازی هێرشی بردە سەر وارشۆ و پایتەختەکەی داگیر کرد، شاعیر بەم بۆنەیەوە ئەم هۆنراوەی داناوە.

**پارچە کوردێکی عێراقین بۆ خەبات هەروەك بەرق**
**تێدەکۆشین نێر و مێمان زدی فاشی بێ فەرق**
**هەروەکو ئازادی خواهو میللەتی ئەهلی شەرق**
**میللەتان هەرکەس لە لایێ وا دەڕۆن بۆ پێشەوە**
**ڕەوڕەوەی مێژوو بە هێزی نازی ناوەستێتەوە**

نەورۆز کە جەژنێکی نەتەوایەتی گەلی کوردە، بەڵکەیە کە باوک و باپیرانمان لە دێر زەمانەوە زوڵم زۆرداریان قبوڵ نەکردووە، کاوەی ئاسنگەر کە رەمزی تێکۆشەری کوردە توانیویەتی زوحاکی زۆردار تەفروتونا بکات و ئاگری ئازادی و سەربەستی هەڵبکات.

کوردە ئیمڕۆ رۆژی شادیت مـوژدەبێ رۆژی نەوە
هەستە ئالای شێر نیشانی زەرد و سوورت هەلکەوە
ئەو زوحاکەی کاوە کوشتی تێپەڕی ئێستا بەخۆت
کۆت و زنجیری لە بیر و هۆش و دەست و پێ کەوە

## شیعری نوێ:

ئەوگۆڕانکاریە سیاسی و رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و فەلسەفیانەی کە لە سەدەی نۆزدەهەمدا بەتایبەتی لە ئینگلتەرا و ئەڵمانیا و فەرەنسا ڕوویدا، رێگاخۆشکەر بوون بۆ لە دایکبوونی رێبازی نوێی ئەدەبی، ئەو بزووتنەوەی کە لە ئەورووپا سەری هەڵدا، تورکیاشی گرتەوە، شاعیرانی کوردیش بەشێکیان لە ئەستەمبوڵ دەژیان بەتایبەتی حاجی قادری کۆیی و پیرەمێرد، توانیان لەگەڵ ئەو رووداو و گۆڕانکاریانە بژین و سوودی لێ وەربگرن، جا ئەو گۆڕانکارییەی کە بەسەر ئەدەبی تورکیدا هات شاعیرانی کوردی باشووریش لەرێگای زمانی تورکییەوە توانیان شیعری کوردی لەنێوان ساڵانی ١٩٢٠-١٩٣٠دا تازە بکەنەوە لەوانە شێخ نوری و گۆران و چەندانی دیکە بوون، بزووتنەوەی شیعری لە شاری کۆیەدا بۆ سەدەی نۆزدەهەم دەگەڕێتەوە، کە کۆیە سەنتەرێکی رووناکبیری و ئەدەبی بووە لەلایەك جەمسەرێکی بازرگانی نێوان عێراق و دراوسێکانی بووە، لەلایەکی ترەوە مەڵبەندێکی زانست و رۆشنبیری بەپێزی ناوچەکە بووە، کە لە هەموو شارەکانی تری کوردستانەوە هاتوونەتە حوجرە و مزگەوتەکانی ئەم شارە خنجیلانە بۆ فێربوون و خۆپێگەیاندن لەوانە: نالی، شێخ رەزا، کەیفی، فایق، ئاهی، صافی، سانی و چەندانی تر، بۆیە شتێکی ئاسایی بووە، کە بەدەیان کەڵە شاعیرو زانا و مەلا و سیاسەتمەداری بەتوانا و لێهاتووی تێدا هەڵکەوێ، کە هەریەکەیان ناوبانگیان لە مێژوودا بە درەوشاوەیی تۆمارکراون و رۆڵی بەرچاویان لەپێشخستن و پەرەپێدانی رۆشنبیری و ئەدەبی و هونەری و سیاسیدا بینیوە، وەك حاجی قادری کۆیی کە هەوێن و مەشخەڵی رێگای کوردایەتی بوو.

بانگەوازی دەوڵەتی نەتەوەیی کوردی ڕادەگەیەنێ شاعیرانی تری وەکو ئەختەر و قاصید و کەیفی و حەزینە و نیهانی و مەنفی و حوسێنی و مەلای گەورە و خادیم، رۆڵی گرنگیان لە وریاکردنەوە و پەرەپێدانی هونەری و ئەدەبی لە شارەکەدا گێڕاوە.

لە پاش جەنگی دووەمی جیهانیدا کە بە نەمانی فاشی کۆتایی هات، نرکە و هاوار و راپەڕین هەموو لایەکی کوردستانی گرتەوە، بڵاوبوونەوەی بیری پێشکەوتنخوازی لەپێناو ئازادی و سەربەستیدا، ئەم ڕووداو و کارەساتانە لەلای شاعیرانی کۆیە بەتایبەتی لە شیعرەکانی (دڵدار)دا ڕەنگییان داونەتەوە، دڵدار وەکو شاعیرێکی داهێنەر و هەڵکەوتوو، رۆڵی گرنگی بینی لە تازەکردنەوەی شیعری کوردیدا، لەتەك دڵداری شاعیردا شاعیرانی تریش

وەکو دلزار، وردی، عوسمان مستەفا خۆشناو، عاصی، سامی، عەودال، ڕۆستەم حەویزی، عەونی، زەکی هەناری، جۆبار و دلاوەر و چەندانی تر توانیان ڕووداوەکانی سەردەم لە هۆنراوەکانیاندا بخەنە ڕوو، دوای ئەمانەش نەوەیەکی چاوکراوەی تر هاتنە مەیدانەکەوە کە توانیان بابەتی نوێتر و تازەتر بخەنە سەر خەرمانی ئەدەبی، لەوانە قوبادی جەلی زادە، فاضل شەورۆ، ئازاد دلزار، نەزەند بەگی خانی، قوباد بەهرەوەر، بەهرە موفتی و چەندانی تر.

# فۆڕمی شیعری

## ١- کێشی شیعر:

لاسایی کردنەوە و پەیڕەوکردنی ڕێوشوێنی شیعری کلاسیکی عەرەبی و فارسی لە غەزەل و قەسیدەکانی شیعری کلاسیکی کوردیدا دەبینرێن، شاعیرانی کورد کێشی عەرووزیان بەکار بردووە، بەتایبەتی کێشی هەزەج و ڕەمەل بەپێی سروشتی زمانەکەیان دەستکاریان کردووە کە لەگەڵ خاسیەتی زمانەکەیان بگونجێ، هەرچەندە زانستی عەرووز لە مزگەوتەکانی کوردستان خوێندراوە، بەڵام مەرج نەبووە کە هەموو شاعیرێ بیزانێ.

هەندێ لە شاعیران ئاگاداری دەستوور و بنەماکانی ئەم زانستە نەبوونە، بەڵام بەشێکی تر ئاگایان لێبووە، بەشێك لە غەزەلەکانی سامی عەودالْ بەر کێشی عەرزوو دەکەون، چەند جارێك لە سامی عەودالم پرسیوە لەبارەی کێشی عەرووزەوە، گوتوویەتی: هیچ شتێ لە بارەی عەرووزەوە نازانم و شیعر لەسەر بنەمای پەنجە دادەنێم، بەڵام لەبەرئەوەی سامی بە شیعری شاعیرانی کلاسیکی کوردی بەتایبەتی نالی و سالم و کوردی و ئەدەب کاریگەر بووە، شیعری شاعیرانی ناوبراویشی تەخمیس کردوون، بۆیە بەهۆی ئەم کاریگەرییەوە هەندێ لە کێشەکانی عەرووز بەتایبەتی کێشی هەزەج و ڕەمەل هاتوونەتە ناو شیعرەکانی شاعیرەوە، دیارە ئەو شیعرانەش هەر بەکێشی خۆماڵی دەپێورێن.

د. مەعروف خەزنەدار لەکتێبی ( کێش و قافیە )دا دەڵێ: ئەو کێشانەی بەخۆماڵیان داناون لەشیعری کوردیدا کێشانیان بەهیجا ڕووداوێکی ئایدۆلۆژییە، ئەگینا گەر بمانەوێ بە عەرووز بیانکێشین دەکێشرێن.

د. ئیحسان فوئادیش لە گۆڤاری کۆلیجی ئەدەبیاتدا دەڵێ: بەشێك لە ڕەخنەگر و نووسەرانی ئەدەبەکەمان مەیل و ئارەزووی تایبەتیان هەیە بۆ فەرامۆشکردنی کێشی عەرووز و پشتگوێخستنی لە پاش قۆناغی گوێزانەوە ( ١٩٣٠-١٩٤٥ )وە دانانی سنوورێکی جیاکەرەوە و بنبڕ لە نێوان سەردەمی بەکارهێنانی عەرووز و کێشی خۆماڵی پەنجە، لەگەڵ ئەوەشدا چەند کێشێکی عەرووز لەلایەن دەستەیەك لە شاعیرانی نوێخوازی پاش کۆتایی جەنگی دووەمی جیهانییەوە بەکارهاتوون.

د. عزالدین مستەفا رەسول لەکتێبی (شیعری کوردی و ژیانی شاعیرانی)دا، لەو بڕوایەدایە کە عەرووزی عەرەبی کتومت لە کوردیدا نییە، دیارە کە عەرووز هاتۆتە ناو زمانی کوردییەوە، دەستکاری کراوە، بەگوێرەی تایبەتمەندی زمانی کوردییەوە.

مامۆستا علاءالدین سجادی لە کتێبی ( نرخ شناسی)دا دەڵێ: هەردوو کێشی عەرووز و خۆماڵی تێکەڵ بەیەك دەبن و بە تەرازووی یەکتر دەکێشرێن، پاشان دەڵێ: گوایە هۆنراوە دوورکەوتۆتەوە لە عەرووز. بەڵێ دوور کەوتۆتەوە، بەڵام ناتوانرێ بوترێ لێی بێ بەشە وەکو ناشتوانرێ ئەو هۆنراوانە کە لەسەر عەرووز دەرۆن بێبەشن لە ژمارەی پەنجە.

بەپێی قسەکانی (د. عەزیز گەردی)ش، ئەگەر شیعری کلاسیکی تەفعیلەکانی لە دێڕی یەکەوە تاکو دوا دێڕ وەکو یەك نەبن، ئەوا کێشی عەرووز نییە بەڵکو کێشی خۆماڵییە بەپێی ئەزموونی خۆم کە لەگەڵ بەشێك لە شاعیرانی کۆیە قسەم کردووە، بەتایبەتی لەگەڵ رۆستەم حەویزی، جۆبار، سامی عەوداڵ، عەرووز لە شیعری کوردیدا بوونی نییە، ئەگەر شیعرێکی کلاسیکی کوردی بەر عەرووزیش بکەوێ، ئەوا هەر کێشی خۆماڵییە، چونکە تەفعیلەکانی لەسەرەوە تاکو خوارەوە وەکو یەك نییە.

لێرەدا نموونەیەك لە کێشی هەزەج دەخەینە روو:

| | | | |
|---|---|---|---|
| پەرێشانم | بەزوڵفی تۆ | بەباڵای ئەو | نەمامی تۆ |
| ب - - - | ب- - - - | ب - - - | ب - - - |
| مفاعیلن | مفاعیلن | مفاعیلن | مفاعیلن |
| کە کوژرام | پەریزادە | لەسەر رووی خۆت | عەباڵادە |
| ب- - - | ب- - - | ب- - - | ب- - - |
| مفاعیلن | مفاعیلن | مفاعیلن | مفاعیلن |

### نموونەیەك لە کێشی ڕەمەڵ

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان × ٢

غەم بخۆم بۆ   دڵ کەڕۆیی   کەوتە کێوان   بێ مەکان

-ب- -   -ب- -   -ب- -   -ب-

فاعلاتن   فاعلاتن   فاعلاتن   فاعلان

یانەسف بۆ   خونچەکێشم   بویتە ئاخ بۆ   بولبولان

-ب- -   -ب- -   -ب- -   -ب-

فاعلاتن   فاعلاتن   فاعلاتن   فاعلان

کێشی شیعرەکانی سامی، کێشی خۆماڵین بە زۆری دە بڕگەیین.

دووگەل یەك بگرن پێکەوە خەبات

بۆ سەربەخۆیی   یەکێتی وڵات

١ ٢ ٣ ٤ ٥   ١ ٢ ٣ ٤ ٥

خونچە گوڵی   نێو بەهاری

زوڵفت بەچین   دێتەخوارێ

١ ٢ ٣ ٤   ١ ٢ ٣ ٤

کێشەکانی شیعری سامی هەمووی کێشی خۆماڵین، بڕگەکانیش بەم شێوەیە: ٧، ٨، ١٠، ١١، ١٢، ١٤، ١٥، ١٦، بڕگەیینە.

## ٢- سەروا:

ئەو دەنگانەیە کە دەکەوێتە کۆتایی دێڕە شیعرەکەوە، ئەگەر دوا وشەکانی لە ڕووی ماناوە دووبارە ببنەوە ئەوا پاشڕەوی پێ دەڵێن، وشەکانی پێش ئەوە دەبن بە سەروا.

جۆرەکانی سەروا کە سامی عەودالّی شاعیر بەکاری هێناون ئەمانەن:

أ- سەروای مەسنەوی (جووت سەروا) ئەوەیە کە دوو نیو دێڕەکە یەك سەروای هەبێ..

AA, BB, CC

خەباتی هاوبەشی کورد و عەرەبی A
پێکەوە بیکەین کارمان چادەبی A
پێکەوە هەستین لەبۆ خوێن ڕژان B
ژەهرە بۆ ژینی ڕەجعیو خوێن مژان B

ب- سەروای یەکگرتوو: ئەوەیە کە شیعرەکە لە سەرەوە تاکو دوابەیت بەیەك سەروا دێتە خوارەوە.

سەر بڵند کە بیرکەوە بیر بۆ یەکێتی میللەتت A
نیشتمانی وەك بەهەشتی پارە پارە و لەتلەتت A
والە دەستی دوژمنانە، تێکۆشن ڕۆژ و شەوێ B
چاو هەڵێنە و بپسێنە کۆتو زنجیر و پەتت A

## ٣-چوارینە:

یەکێکە لەو هونەرانەی کە لە ئـەدەبیاتی رۆژهـەڵات و رۆژئـاوادا بـەکاردێت ئەوەنـدە هەیـە شێوازی قاڵبەکەی دەگۆڕێ، لە کوردیدا بەزۆری قاڵبەکانی ئەمانەن:

AABA, AABB, AAAB, AAAA

بێچوە شێری کورد ملیۆن هەزارە    A
لاوی خەباتکەر مەرد و بەکارە    A
مردن پاشەرۆژ لەبۆ زۆردارە    A
چی بێ سەربڕین بمرێ مردارە    A

***

کە من بێ بەش بم لەو خاك و بەرە    A
چ رۆم زەوتی کا چ ئینگلتەرە    A
بەمن چی خونچەی باغ و باغاتی    B
چی لێ بکەم هەوای فێنك و تەڕە    A

## ٤- پێنج خشتەکی:

هونەرێکە لە ئەدەبیاتی رۆژهەڵات و رۆژئـاوادا بـەکارهاتووە، بـەڵام قاڵبـەکانیان جـوداوازن، ئەوەیە کە شاعیر شیعرێکی شاعیرێك وەردەگرێ، هەردوو نیوە دێڕی شاعیرەکە سێ نیوە دێـڕی خۆی دەخاتە سەری، بەمەرجێ هەمان کێش و سەروای شیعرەکەی هەبێ کە تەخمیسی دەکات، جاری وا هەیە شاعیر شیعری خۆی تەخمیس دەکات.

شیعری فوئادی جەلی زادە پێنج خشتەکی سامی عەودال.

قـــەڵای (غەمـــدان)و کوێـــستان‌و هـــەواری نـــەو بـــەهار هیـــچە
ئەگـــەر خـــارای فەرەیـــدوون بـــێ لـــە ئـــاڵتوونیش دەوار هیـــچە
تـــــەڵاو گەوهـــــەر و دوڕی جیهــــان بـــــابێ بـــــەبار هیـــــچە
((کـــەتۆم یـــار بـــی عـــەزیزی مـــن هـــەزار و یـــەك نـــەیار هیـــچە
لـــە راســـت زەبـــری تفـــەنگێکا ڕمـــاحی بـــێ ژمـــار هیـــچە))

**٥- تـــاك:**

هونەرێکە لە ئەدەبیاتی رۆژهەڵات و رۆژئاوادا دەبینرێ، لە ئەدەبی یۆنانیدا یـانیس ریتـسۆس هونەری تاکە شیعری نووسیوە لە شیعری کوردیدا مەولەوی و نالی و شێخ نوری و چەندانی تر پەیڕەوی ئەم هونەرەیان کردووە، شاعیرە نوێخوازەکانیش عەباس عەبدوڵڵا یوسف تاکە شیعری هەیە.

تاکە شیعر ئەوەیە کە شاعیر لە تاکە دێڕێکدا ئەوەی مەبەستیەتی دەیخاتە ڕوو.

سامی شاعیر دەڵێت:

* صاحبی هادی، جەللادی عادی
فیسقو فەسادی دەبێتە شادی
* ئەگەر بەمن ڕازینە
مایەی خۆشی ژینە
*دەزانی ژیانی ئینسانی
نەزانی بزانی ڕەزانی

**٦- هونەری ڕەوانبێژی:**

شاعیر پەنا دەباتە بەر هونەری ڕەوانبێــژی بۆئــەوەی بابەتەکـە بــەهێز و تۆکمــە و جــوان بکات، لێرەدا سامی شاعیر ئاماژە بە پەندی کوردی دەکات کە دەڵێ:

**"ئەگەر هاوین و گەر زستانە**
**بەشی کەچەڵ هەر دوو نانە"**
**بەبێ لێف و بێ سێبەرم**
**لە گەرمێن و لە کوێستانە**

* * *

شاعیر ئاماژە بە پەندێکی تری پێشونان دەکات و دەڵێ:

**"نە پێڵاوی تەنگ نە خانەی بە جەنگ**
**نە هاوڕێ لەگەڵ خوار و خێچو لەنگ"**
**نە ئەشعاری خۆت بدە پیاوی کەر**
**نە چوون لەبۆ لای گەورەکی دەبەنگ**

سامی ئاماژە بە ئایەتێك دەکات و دەڵێ:

**لیس للانسان الا ما سعی**
**کەینێکە مەنجەڵ هاتیتە قیچان**
**لەلایەن من و لەلایەن هیچیان**
**نیشان چی نەبێ چۆن دێتە خیچان**

## ٧- زمانی شیعری:

بەدەیان وشەی عەرەبی و فارسی لەلای شاعیرانی کورد دەبینرێن، هەندێ لەو وشانە پەیوەندییان بەزانستی ئاینەوە هەیە وەکو فیقه و ئوسولّی دین و مەنتیق و فەلەك کە بەشێوەی وەرگرتن و تێهەلکێش و جوانناسییەوە بەکارهێنراون، بۆیە دەبینین ئەو شیعرانەی کە موناجات و پاڕانەوەی تێدایە هەمووی کاریگەرە بە ئاینی ئیسلام و قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەری تێدا بەدی دەکرێ، جا لە شیعرە ئاین و دڵدارییەکانی شاعیردا وشە و دەستەواژەی عەرەبی دەبینرێن، بەلّام لە شیعرەکانی کۆمەلّایەتی و فەلسەفی و سیاسیەکانیدا وشەی پەتی بەکار بردوون و بەشێوازێکی زۆر ساکار و سادە دایڕشتوون تا بە زووترین کات پەیام و مەبەستی خۆیان بپێکن.

لە شیعرە سیاسیەکاندا، شاعیر هەولّی داوە کە بەزمانێکی یەکجار ئاسان میللەتەکەی هۆشیار بکاتەوە و ڕێگا چارەشی بۆ دەستنیشان کردوون، بەلای شاعیرەوە ڕێگای بەرەنگاری و شۆڕشگێڕی تاکە ڕێگایە بۆ بەدەستهێنانی ئازادی و سەربەخۆیی.

(١)

## سرود

دو گەل یەکبگرن پێکەوە خەبات
بۆ سەربەخۆیی و یەکێتی وڵات
سەرکەوتن بێ شك هاتەکایەوە
رۆژی ئازادی و دەستکەوتی وڵات
دەستکەوت و هەڵات رۆژی ئازادی
بۆ ژینی گەلان بۆ خۆشی و شادی
بۆ ژین تێکۆشین لەو نیشتمانە
وەکو بەهەشتە دوور لە فەسادی
هەینێ دەبینن وەك باغی سەبا
گوڵی خوێناوی دەژێتن بە با
کەوا سوور بووە بەخوێنی لاوان
مێشك لەق دەکا دەژێنێ و دەبا
لە بروسکەی گەردون سام دەچێتە دڵان
با خۆشەن دەکا بە درەخت و گوڵان
پێشمەرگەی شەهید گیانی دێتەوە
بۆ جەژنی نەورۆز لەگەڵ بولبولان

(٢)

## سرود

کورد مافی وەرگرت لە یازدەی ئازار
شایی و سەیرانە لە باغ و گوڵزار
درەخت و کانی گشتی ژیاوە
گوڵوکی شاخان دەژێ بە باوە
ئەو باغ و شاخ و ئەو دۆڵ و دەشتە
وەك باغی یەزدان دەڵێ ی بەهەشتە
ئاوی هەڵ دەکوڵێ لە شاخان دەڕژێ
بەسەر گولوکان دەڕوا و دەپڕژێ
دەپرژێتە سەر خونچەی گوڵانە
بولبول دەخوێنێ لەو کوردوستانە
دەڵێ جەژنە هات لە مانگی ئازار
ئاوی جۆبار و کانیلە و رووبار
دەرژێ دێتە خوار دەڵێ ی کەوسەرە
بەسەر خاکی وەك دووڕ و گەوهەرە
وا رازایتەوە هەروەکو سەبای
درەختی دەژێ دەپشکوێ بە بای
خۆشی و شادی بەخشی مۆژدەی ئازار
ئاوی ئازادی لقی دێتە خوار
بۆ سەر پێشمەرگە و بۆ سەر ئەو لانە
سەر لاشەی پاکی خوێن رژاوانە
پشکوت دەمی دا گوڵی خوێناوی

دەڵێ هەرماوە پێشمەرگە و ناوی
کچی وەك حۆری لاوانی غیلمان
کوردستان بوویتە بەهەشتی یەزدان
(سامی) بروسکە و تریشقەی بەهار
دەبتە چراخان لەناو بەرد و دار

## شوکرانە

سەت شوکور خوێنی لاوان وەستاوە
ڕۆلانی میدیا و مستەفا و کاوە
بەیداغی کوردان دەژێ بە باوە
شایی و سەیرانە لەناو گوڵزارە
جەژنەیە جەژنی شادی و ئازارە
کورد قەت نەترسا لە گوللەی گەرم
لەرێ ی ئازادی و ژینی هوننەرم
خوێنی دەرێژم سەرچاو و سەرم
شایی و سەیران لەو گوڵ و گوڵزارە
جەژنەیە جەژنی یانزەی ئازارە
نابێ رۆژبێ لە کورد و کوردوستان
بە شادی گەل و دراوسێ و دۆستان
وا ماڤ گەلمان هاتە ناو دەستان
جەژنەیە جەژنی یانزەی ئازارە
شایی و سەیران لەو گوڵ و گوڵزارە

کورد مافی وەرگرت لە یانزەی ئازار
رووخا پیلانی دوژمن و زۆردار
تاساوە مێشك بڕوای ئیستعمار
جەژنەیە جەژنی یانزەی ئازارە
شایی و سەیران لەو گوڵ و گولزارە
جەژنەی پێشمەرگە و جەژنی لاوانە
ئیمڕۆ کە بەهەشت خاکی کوردانە
لە دەشت و شاخان کەیف و سەیرانە
جەژنەیە جەژنی یانزەی ئازارە
شایی و گۆوەند وا لەنا و گوڵزارە
سامی لاوی کورد ئەو پێشمەرگانە
وا دەنگی داوە لە هەندەرانە
ئیمڕۆ کە رۆژی مێرو مەردانە
جەژنەیە جەژنی یانزەی ئازارە
شایی و گۆوەند وا لەناو گوڵزارە

# ئەی لاو

هەستە تێکۆشە چاوت هەڵبێنە
لە ڕێی ئازادی خوێنت بڕژێنە
مەڕۆ ئازاد بە دەست بوەشێنە
نیشتمانی حورگەلێکی ئازاد
بە خوێن دەخولقێ دوژمن کا بەرباد
بینتەوە مێژوو ڕۆڵەی کەیقوباد
هەر خوێن ڕەواجە ئازادی بکڕێ
مردن بۆ دوژمن کفنی بۆ ببڕێ
خوێنە خەنجەر و ورگی پێ بدڕێ
هەر خوێن و هێزە ژیانی جیهانی
بۆ هێمنی گەل و خۆشی و ژیانی
بۆ دانەوێڵە و بۆ نان و خوانی
ژیانی هاوبەش دێنێتە کایە
لۆرتان دەکاتە خاوەن سەرمایە
بەترسنۆ دەڵێن دانی خودایە
هەستە بەبێ سام هەرچی قەومابێ
بەخوا قەوماوە هەر دەبێ وابێ
بێ خوێن ڕژاندن مێژوو چانابێ

# برایی

خەباتی هاوبەش کورد و عارەبی
پێکەوە بیکەین کارمان چادەبی
پێکەوە هەستین لەبۆ خوێن رژان
ژەهرە بۆ ژینی رەجعیو خوێن مژان
هەستە تێکۆشە لاوی نەوجەوان
چاوی لەتۆیە گەل و نیشتمان
وردبەوە بۆچی خاکت لەتلەتە
بۆ لاوت لەبەند زنجیر و پەتە
بەخوێنی تۆ یە ئازادی وڵات
دوژمن پشتی دا وەك رێوی هەڵات
چەندە بەکەڵکە خەباتی هاوبەش
دوژمن دەکاتن بێ بەش و ڕوو ڕەش
چەندە بە سامە خەباتی خوێنین
لەبۆ ئازادی خوێنی بڕژێنین

## دووباره سوپاس

سەت شوکر کۆماری کورد واهاتە کایە و هاتەکار
هاتە کوێستانی ژیانی کەوتە ناو کەیفی بەهار
دایە بەر شەق بەند و دیلی هەروەکو گۆڕایفراند
خێوەتی خارای بەرز کرد سینگ و ئەستون دە و دەوار
دەنگی کوردستانی رەنگین هەروەکو هەورێ بە رۆژ
هاتە بەرچاوی گەلان وا نەخش و دانانی هەوار
لەو بەهاری سەربەخۆیی خونچە هات دەمکاتەوە
عادەتە ئاوی لەدەم بێ خوێن لە زاری دێتە خوار
ئەو خوێنەی وەك رژاندی لاوی سەربازانی کورد
وەك لە شاخی نیشتمان و خاك و دۆڵ و بەرد و دار
وا گولوکی سور بووە بۆنی هەناسەی با دەبا
بۆ جیهانی سەربەخۆیی و دوژمنانی شەرمەزار
ناحەزی سەرشۆڕ و ڕووڕەش دۆڵچی زۆرنا لێدەدا
وا لە مێژوو ناپەسەند و زەرد و سیسو لێو بەبار
(سامی) گیان بەخشی گەلی کورد دەنگی رادیۆی هەندەران
دەیکەنە تەسجیلی مێژووی مەکتەبە و کۆشك و تەلار

## بەرای من

کوردوستان بە شەڕ چوو بۆ ناو شادی
ژیانی ئازادیو خۆشی و مرادی
ژینی هاوبەشی و لێک دی ئەمین بوون
نەڕژانی خوێنی ئادەمیزادی
بڕژێ لەجێی خۆی گەر هاتوو ڕژا
ببیتە بە ئاوی داری ئازادی
قەت نابێ بە قسە و بە خۆپێشاندان
بە قسەی خەیاڵی ناو باخچەی نادی
(سامی) پێ ناوێ هیچ لازم ناکا
ئەوانە دەمرن بەبێ مرادی

## هێمنیت چۆن دەوێ

هێمنایم دەوێ هێمنایم دەوێ
گەلێک مان نەدیت وەها سەرکەوێ
دەست نەکاتەوە و زۆر ئازا نەبێ
دەبێ وەکو خاک لەبن پێ کەوێ
وەکو قالۆچە نەجوولێتەوە
لەبن پێ ی کەران بتولێتەوە
مافی خۆی نەوێ بڵێ هێمنم
مستەحەقی بێو با بڕزێتەوە

گەلێك لە ژین دا لە رژانی خوێنێ
مەردانە و سەخی خوێنی بڕژێنێ
وەکو شێری نەڕ ڕو بەڕوی دوژمن
دەست بکاتەوە و دەست بووەشێنێ
ماف وەردەگیرێ هەر بە خوێن رژان
خوێنی بڕژێنێ لە گۆشەی مەیدان
(سامێکی) نەکا لە گوللەی گەرم
لە فرۆکە و شەستیر لە تۆپی زەمان

## نەورۆز

جەژنە ئەمڕۆ جەژنی کورد و رۆژی شادی و رۆژی نەو
ماف وەرگرت هاتە کایە هاتە دەست و هاتە دەو
لاوی کورد گشتی لە مەیدان راپەڕی هەستا لە خەو
خائینی ئیمڕۆ بە گشتی رووڕەشن وا مل کەچن
چی دەکەن ئەوجا لە خۆیان قوڕبەسەر بۆکێ دەچن
ئاوژیاوە گشت لە باغان خاك و گوڵ خونچە و هەوای
لاوی کورد وەك بێچووە شێران لەشکر و هەم پێشەوای
مستەفایە خۆشەویستی سەروەر و گشتی گەدای
داری ئازادی بەریدا وا بە گوللە و خوێنی گەش
گوڵ لە باغان وا دەمی دا لاوی کوردان هاتە بەش
کێوەچوون کا دوژمنانی خوار و وخێچوو دڵبەخەش
گوڵ بەخوێنی وا پشکوی هەر بەخوێنی لاوەکان

باغ و دەشت و دیمەکاری سومبولی ناو شاخەکان
خوێنی پێشمەرگەی لە دەم دێ هی جەرگ سووتاوەکان
ئیمڕۆ ڕۆژی تازەیە نەورۆزی کورد واهاتەوە
دەرگەیی شادی لە میللەت هەر بە خوێنێ کاتەوە
بەیداغی کوردی شێر نیشانی کۆنی خۆی هەڵکاتەوە
خائینی ئیمڕۆ بەگشتی ڕووڕەشن وا ملکەچن
چی دەکەن ئەوجا لە خۆیان قوڕبەسەر بۆ کێ دەچن

## گوڵاڵە سوورە

ئەی گوڵە سوورەی بە خوێنی لاوان
ئاوت خواردەوە لەناو گوڵاوان
کەوا پڕ بوو بوو لە خوێنی کوردان
کوردی چەك هەڵگر هەروەکو مەردان
خوێن بوو بە ئاوات پێشمەرگەی ئاودێر
لە پێچە پێچوو لە کەند و هەڵدێر
شین بووی دەمەت دا لەناو دێمەکار
بۆ ڕێی ئازادی و کوردی بەختیار
نەترسان لە تۆپ لە شریقەی بڕنەو
لەناو سەنگەران بە ڕۆژ و بە شەو
ئەوا شنەی بای بۆ خۆشی و شادی
دەژێنێ داری میوەی ئازادی
دوژمنی کوردان لە کۆڕی خەبات

وەك شێر نەڕاندی وەك ڕێوی هەڵات
ئەوا دانیشتووی ئەرز و سەماوات
دەڵێن کورد دەبێ بگاتە ئاوات
نیزیکە کۆمار ئەوا دێتە کار
لەناو کوردوستان پایتەخت و هەوار
ئەوجا بە کوردی بە دەنگی مەردی
دەیکەین بە جەژنە لە دار و بەردی
خائین دەبایە بمردابان نەك
بۆ حیزی حیزان ببن بە دۆشەك
بەیداغی کوردان هەر دەژێ بە سام
دوژمنی سەرشۆڕ چی دەدا وەرام

## دەلال

. شۆڕشگێری کورد دەلالی ناودار
کچێکی مەردی کوردی بەرخوردار
تێکۆشەرێك بوو لە خاکی تر کەش
لە سێدارە درا لە ژین بوو بێ بەش
هەڵیان ئاوسی بە کەزیەکانی
قوربانی گەل بوو ماوە نیشانی
خنکا بە زولف و کەزیەکەی خاوی
بۆ گەل ناسینی دەلالە ناوی
خنکا شۆڕشگێڕ کچی ناو دەلال

گـــەل یـــادی دەكـــا لـــە مێـــژوو بـــە ســـاڵ
بـــە كەزیـــەكانی وەك ئاوریـــشمی خـــاو
گیانیـــدا یـــەزدان دڵیـــری بـــە نـــاو
بـــەڵام نـــامرێ نـــاوی هـــەرماوە
ئـــەوی بـــشمینێ بـــاقی هـــەر نـــاوە
لـــە ژێـــر چـــاودێری پیتـــۆری دەرســـیم
نـــوری دانـــەر بـــوو لـــە مێـــژوو پرســـیم
ئـــەو ناودارانـــە بـــەرز و گـــرانن
لـــە مێـــژووی كـــوردان خـــاوەن نیـــشانن
پیتـــۆری گـــەورەش لـــە بەندیخانـــە
گیـــانی دا یـــەزدان خـــاوەن نیـــشانە
لـــەرێ ی دانـــانی كـــورد و كوردســـتان
بـــۆ خنكانـــدنی بـــە گـــورجی هەســـتان
دەلال و نـــوری خۆبـــە و جـــاخی رۆن
لـــەناو كوردوســـتان خـــاوەن خـــاك و تـــۆن
بۆیـــێ هـــەزاران لـــە لاوانـــی كـــورد
لـــە رێ ی هـــەزاران لـــە لاوانـــی كـــورد
لـــە رێ ی نیـــشتمان لـــە بەندیـــدا مـــرد
لـــە دەنگـــی دەلال هەســـتاون لـــە خـــەو
قوربـــانی دەدەن بـــە رۆژ و بـــە شـــەو
لـــە رێگـــای گـــەل و كوردوســـتانی خـــۆش
خـــەیاڵی خـــاوە دوژمـــنی بـــێ هـــۆش
لـــە رێ ی فاتیمـــە و دەلال و نـــوری
خـــوێنی دەرژێـــنن بـــەبێ قـــسوری
وەكـــو خـــانزاد و شـــایە قـــەدەم خێـــر
قـــازی پێـــشەوا شـــێری بەچـــكەی شـــێر
هـــەروەك شـــای بابـــان وەك پاشـــای كـــۆرە
شـــاهی رابـــردی چـــەند بڵـــێ ی زۆرە

بڕۆ بپرسە لە کوردی تۆران
فاتیمەی دلێر بۆ دەور گۆران
چ کاری دەکرد لەبۆ قەومی خۆی
بۆ نیشتمانی حوڕ و سەربەخۆی
دوژمن هەر دەمرێ لە سامی کوردان
ڕێ ی لێ گیراوە ماوە سەرگەردان

## بەخوا باوکەکەم

هەر گەلێک گەورەی دینار پەرست بێ
دەبێ وەک حەیوان هەر گوێ لە مست بێ
لە دەست بێگانان هەر بۆ سەربڕین
یا وەکو مەیمون هەر بۆ هەڵپەڕین
هەموو کات شێت و هەر دڵ پڕقینن
بەوان بێ کۆربن یەکدی نەبینن
یا لە پەنایان وەکو پیسپیسۆک
یا لە دەرکان بن هەروەکو کسۆک
دژۆنو گوڕی بە زۆری پیسک
ئاهی لێبدەن بۆ شێوێک نیسک
سوک و چروکو ناشیرینو بێ سام
لەلای بێگانان سارد و سوڕ بێ تام

## گوێ لەمست

هەنـــــدێ کـــــات دوژمـــــن دەیکاتـــــە بـــــاوەش
زۆرنـــــای بـــــۆ لێـــــدا هـــــەر وەکـــــو چـــــاوەش
یـــــاخۆ هـــــەروەکو کـــــەری لابـــــاران
هـــــەر رۆژێ یـــــەکێك بیبـــــا بـــــۆ داران
داری پـــــێ بـــــێنێ هـــــەر بـــــە نـــــەقیزە
چـــــونکی نامـــــەرد و سەرشـــــۆڕ و حیـــــزە
(ســـــامی) پێویـــــستە بـــــیری خاتـــــەوە
لـــــە خـــــەو هـــــەڵ بـــــستێ و چـــــاوی کاتـــــەوە

## مێژوو دەزانێ

میللـــەتی کـــوردی میللەتـــە هـــەر لـــە دەوری کۆنـــەوە
ســـەر بڵنـــد خـــاوەن خـــەبات و عـــیلم و مێـــژووی رۆنـــەوە
وا درەخـــتی شـــاخی کـــوردان گـــەردونی شـــین کـــردووە
شـــەوقی شـــینی دایتـــە دەریـــای ئەتڵـــەس و ژاپۆنـــەوە
وێنـــەیی خونـــچەی لـــە شـــاخان کەوتـــە نـــەینۆکی زەمـــان
خـــوێنی پێـــشمەرگەی رژاوی هاتـــە چـــاوی جۆنـــەوە
وا لـــەزاری شـــەرق و غەربـــە کەوتـــە نـــاو بـــیری ئـــەمن
تـــا ئۆمـــەم نـــاوی بهـــێنێ باســـی کـــا بـــەو بۆنـــەوە
ئاشـــودانی ســـەربەخۆیی ئـــاوی خوێنـــە هـــەر بـــە خـــوێن

چــۆن دەبــێ بەنــد بــێ لــە جێگــا و فــایلی نایلۆنــەوە
(ســامی) زۆرە هێــزی گــەلمان لــەرزی گرتــووە دوژمــن
ئێمە پـــۆلا ئــەو بـەخــۆ بەو خەنــجەری فــافۆنەوە

## مدیر تەحریر و شێخ

شــیعر و عــیلم و ئــەدەبییات بــێ کــەس و بــێ چــارەیە
ئیمــڕۆ نرخــی ئــادەمیزاد هێــز و کورســی و پارەیــە
وا لــە دنیــا ئــەو لــە کــارە مەنــسەبوو تــاجی هەیــە
ئــەو لـــەجێی علــم و نیــزام و سیاســەتو ئیدارەیــە
بــێ بەشــی لــەو ســێ شــتانە و وادەژێ لــەو عەســرەدا
شــێت و هــاری بوویتــە میــوەی بەرهــەمی ئــەو کارەیــە
وا بـــە(ســـام)و وا بـــە برســـی مردنـــت زۆر چـــاترە
یـــا هـــەژار یـــو یـــا لەبەنـــدی یـــا پـــەتوو ســێدارەیە

## پێشەوا

ئــەی دلێــری شــێری کــاتو خــوێن گــری خــوێنی رەگــەز
دەســت کــەوە هەســتە بەمــەردی لاوی پێــشمەرگەی نەبــەز
مـــــوژدەبێ بـــــا خـــــوێنی تۆیـــــە مایـــــەیی ئازادییـــــە
ئــەو خوێنــەیی وەك رژاوە بــۆ حــەقی نــەك بــۆ غــەرەز
وا لــــە شــــاخان دا ڕژاوە گیایــــەکان دەی خواتــــەوە
بــــۆ ئــــاوی زاری خونــــچان کــــاتی دێ دەم کاتــــەوە

بولبـــولی وا نائومێـــده خـــوێن لـــە زاری دێتـــە خـــوار
تـــاکو بەیـــداغی بـــەرزکا و بـــۆ گـــەلی هەڵکاتـــەوە
مـافی خـۆی نووسـی بـە خـوێن بـۆ کـوردی مـەردی خـۆش زمـان
بـانگ دەکـا ئـەی شـاخەوان و بێـچوە شـێری نیـشتمان
دوژمنـــت وەك شـێر نەڕانـدنی ئێـستا وەك ڕێـوی هـەڵات
هاتـە ژێـر پێـی خـوێن ڕژاوان کەوتـە گـۆڕێ تێـك شـکان
بـانگ دەکـا بـۆ یەکـدی بـوونی خاکـە کـەی باڵاکـەتان
ببنـــە شـــورەیی ئاســـن و ئەرزەکـــەی واڵا کـــەتان
تـا بڵـێن(سـامی) نـەما خـۆ لاوی کـوردی سـەربڵند
وەرنـــە ســـایەی ســـەربەخۆیی ســـێبەری ئاڵاکـــەتان

## بێ مردن نابێ

مــن خۆشـی ژیـنم نـاوێ یـا سـێدارە و گۆڕسـتان
یـان سـەربەخۆیی بـۆ گـەل کۆمـارێکی کوردوسـتان
نیـــشتمانێکی حـــوڕ و میللـــەتێکی ســـەربەخۆ
بـە خـوێنی ئـەو لاوانـەی بـە خـوێن ڕژانـدن هەسـتان
بـــە گیـــانی ئـــەو لاوانـــەی لـــە ســـێدارە دراون
لـــەناو کـــۆت و زنجـــیر و بەنـــدی بێگانـــان مـــاون
مێـــژوو ناویـــان دەنووســـێ لـــەهاتی پاشـــەڕۆژی
گـاز دەکـا ئـەی شـەهیدان ئێـستا زیندونـە و مـاون
بـە خـوێنی ئـەو لاوانـەی خـوێنی سـوریان ڕژاوە
بـۆ مـافی میللـەتی کـورد لـە سـێداران دراوە

گیانی وا پاسەوانە و خوێن بۆ داری ئازادی
داری ئازادی روان لە بنجی خوی ژیاوە
سەت شوکر باس دەکرێ لەناو ئێزگەی هەندەران
دڵی دوژمن دەژێنێ بەکرێگیرا و نۆکەران
لە ترسی پێشمەرگەی کورد وەکو مامز رادەکەن
دنیای لێ کردن بە بەند(سامی) خاوەن هونەران

## بۆ مافی گەل

هەردەبێ لەگەڵ ئادەمیزادی
نیشتمان پەروەر داری ئازادی
بە خوێن ئاو بدەین بەربدا بۆ گەل
بە شایی و گۆوەند لە باغی شادی
رۆڵەی میدیا و نەوەی کەی قوباد
هەڵپەرکێ بکا لە باغی مراد
ئەو باغەی داری بەخوێن ئاودرا
شین بوو بەری دا بۆ کوردی ئازاد
نابێ بخۆین و تێر بنوێن شەوێ
یا دەبێ بمرین یا مافمان دەوێ
دەست هەڵناگرین لەتمان بکەن
هەر دەبێ گەلی کوردان سەرکەوێ
بە خوێنی دلان سپی کاتەوە
دەرمان و ژەهری لێک دی کاتەوە
دەرمان فرۆشیو فەحسی بە دینار

له بیری مەرگم کەم بکاتەوە
وەك داكی دڵ سۆز نەك بە دیناری
بنۆڕتە نەخۆش برسیو هەژاری
دڵی با هەرکات لەلای دینار بێ
(سامێکی) نەکا لە دەردەداری

## ئێ بۆ وایە

هەندێ کەس برسیو بە بێ کڵاوە
لە برسان سیس و کاڵە دڕاوە
هەندێکیش تەلار بۆی ڕازایتەوە
خواردنی مریشك و گۆشت و پڵاوە
یان هەنگوین و شیر دەژی بە باشی
لەسەر قالیچە و لە قەسری کاشی
لە خەو هەڵدەستی حەمام حازرە
هەژاریش نیتی پارەی باراشی
لەسەر حەسیرێ گوشێکی دڕاو
بێ کونجە خانی نە نان و نە ئاو
(سامی) لێ دەکەن وەکو ئیزرائیل
کاتی قوڕ شێلان کە چووە ناو قوڕاو

# بەغدا

لەکاتی خۆی دا چەند شادمان بووی
لە مێژووی ژیان قورس و گران بووی
ئێستاش هەروەها ناوداری مێژووی
پایتەختی شاهی نەوشیرەوان بووی
شاهیدت هەیە بڕوا پێکراو
لە مافی کوردان زۆربێ گومان بووی
لەناو راستی دا وەك خۆت مایەوە
مەرد و خاوەنی شەرتو پەیمان بووی
خەلقانی جیهان باشت ئەناسن
جێگای بە(سامی) شاهی کوردان بووی

# بۆ سەیرە

هەزاران روتو وابێ نانی جۆن
ئەوا پێخواس و بێ ئاو بێ دۆن
یەك کەس تەلار و لە باغی گوشاد
دینار دادەکا دەجار بە ملیۆن
هەندێك هەنگوین و برنج و مریشك
هەندێ ساوار و توریش نیە بیخۆن
سەتان بێ فلس و بێ بەرگو ڕووتن
بەگیش گەنم و برنج دادەکا بە تۆن

هەزار بێ کفن و جێ گۆڕی نییە
بێ چرا و حەسیر لەژین دا خەڕۆن
من بەخۆم پیرم بڕوام تازەیە
تۆ لاوی تازەی بیر و بڕوا کۆن
هەندێ وا لەبۆ جگارەی دەمرن
هەندێك بە بێ (سام) عارەقی دەخۆن

## دەمم مەکەوە

قسەی بن بەڕێ بێتە سەر بەڕێ
بەخوا هەر گورگی لە پێستی مەڕێ
لە خەلقی وابێ قوتبی مەداری
زارم مەکەوە ئەوجا لێم گەڕێ
دەڵێی من زێرم کەچی پاقری
بۆ لاشەی هەزار ژەهر و ئاگری
لە قسان دەرمانو کەچی هەر ئیسقای
میقرۆبی مەرگی لاشە داگری

# ئایدیۆلۆجی

هەر کوردێ خاوەن نیاز و مەبەست بێ
نیشتمان پەروەر یادی رەگەز بێ
دەبێ وەکو شێر مەرد و نەبەز بێ
ئەوجا بیرکەوە چاوت هەڵێنە
دەمت ببەستە دەست بوەشێنە
هی مافت دەخوا گیانی دەربێنە
داری ئازادی بە خوێن رواوە
بە خوێنی لاوان ئاوی دراوە
بۆ ماف ستاندن هەر خوێن رژاوە
داری ئازادی واخوێنی دەوێ
بۆ گەل بەربدا ماف دەست کەوێ
نابێ خەیاڵ و بە داڵغەی شەوێ
مەترسە مردن بۆ ژین بچێژە
خوێنی دوژمنت وەك سەگ برێژە
لاشەی بۆگەنی لە خاك بنێژە
هەستە رۆڵەکەم کۆرپەکەی ژیرم
رۆڵەی شیرینی برواکە و بیرم
تۆ لاوی تازەی منیش وا پیرم
ئەوا هات کاتی دانانی کۆمار
لەگەڵ سەرۆکی بەرزی بەرخوردار
سوپاسی بکەن بە ملیۆن هەزار
مەڵێن گەلی کورد(سامی) نەماوە
شەری کوردوستان وا دەنگی داوە
دوژمن پشتی دا جەرگی بڕاوە.

## قوربان

ئەریّ توخوا سەرمایەدار هەتا کەینیّ کۆشك و تەلار
بیّ لە خونچە قەسری کاشیت بیّ لە مەڕو دوکانی شار
بیّ لە ڕەزی خۆخ و تریّ بیّ لەهەرمیّو سێوو هەنار
بیّ لە برنج و هەنگوینی ڕاو بیّ لە چۆمی بیّو ئەسپیندار
بیّ لە باویو سماقی سۆر لە هەنجیری ناو دیمەکار
سەت گوند و پاوانت هەیە وا لە ژمارەی برسیو هەژار
چی لیّ دەکەی بۆ کیّ ی دەبەی کانی(سامی)پەروەردگار

## سامی بلێ

ئەمن جەللادی حزبی نازیمە
بە مردن بۆ ژین لە شانازیمە
خوێنمژ لەلای من نابتە قۆندەرە
هەزاری دەستی ئینتیهازیمە
لەتلەتم بکەن لە شۆڕشی گەل
هەینیّ جەژنەمە و زۆر پیّ ڕازیمە
چەکی پێشمەرگە و ئالای سەربەستی
بۆ چاوی دوژمن چەنگی بازیمە
نەك وەك بیّ ڕوەکان لەبۆ گریڤن
لەبۆ دینار و لوقمە قازیمە
وەك شێری برسیی بیّ لانو دەم بەش
لە هێرش بردن لە بیّ وازیمە

نابەزم هەتا رۆژێکم مابێ
دەمرم لەبۆ ژین لە داخوازیمە
(سامی) لە دەستی گەلی کوردانە
هەردەم خەباتی سەفەر سازیمە

## ئەرێ

بەختە کەچەکەی رۆڵانی کاوە
بۆ دەرنەکەوت و لە گەردون ماوە
بۆ نەهاتە خوار لە شەریقەی شەستیر
بزانێ خوێنی چەند لێی رژاوە
خوێنی لاوی کورد ئەوا دێتە خوار
لە شاخ و داخان وەك کانی ئاوە
من گازتان دەکەم لاوانی سەرباز
چرای کوردوستان وا هەڵگیرساوە
بە خوێنی ئێوە ئەوا دەسوتێ
شەوقی دا فەلەك عەرشی خوداوە
بۆیێ گولیکو گڵ و بەردی کورد
دەڵێی بارانی خوێنە رژاوە
خوێن و خەباتی پێشمەرگەی وڵات
لە گەشتی جیهان وادەنگی داوە
کەواتە بێ (سام)ئیتر گۆمەدەن
هەرچی قەومابێ ئەوا قەوماوە

# نیشتمان

خوێنی پێشمەرگان هۆی رزگارتە
دەڕژێ بۆ گەل و ڕێگای چارتە
واشەو هێشك چین رۆژان وەك پڵەنگ
لەناو ڕووبار و بەردو دارتە
بە خوێنی لاوان گوڵ خونچەی دەدا
پێ نوس بولبولی ناو گوڵزارتە
قەت بنی نایێ هەتا بی نووسی
نووسەری دڵسۆز دەردەدارتە
باسی تۆ لە ناو لێ نووسی جیهان
جێ ی نابێتەوە لە هاوارتە
بەڵام مۆژدەبێ پێشمەرگەکانت
مەکۆی لە شاخ و مێرخوزارتە
وا بەیەك رەنگی سەرۆك بارزانی
پێشەوای گەلە و لەناو غارتە
ئەوا سەرۆکو خەبات کەرو لاو
چوست و بە(سامی) کاروبارتە

# باس و گلەیی

ئەی وەتەن تۆ چی لەبۆ من خۆشو شادی چیت هەیە
باغی پڕ گوڵ دەنگی بولبول سازی فیردەوسیت هەیە
هەندێ ئەرزی نێرگزین و سومبول و هەم یاسەمین
باسی ناکرێ گوڵ لەکێوان خاوو نەسرینت هەیە
سێوەرە و وێنجەی شلێر و حاجیلە و رەیحانی دەشت
مەندیلانە و نەوعی هێرۆ بۆنی بەیبوونت هەیە
روونی سپیان گەنمی یەك تۆ برنجی عەنبەر زۆرە خۆ
مێوژ و دۆشاوت بە زۆری ڕاوی هەنگوینت هەیە
خۆخ و هنار و ناسکە هەرمێ هەم هەڵوژە هەم گەلاز
باغی پڕ مێوە و تەعامو سێوی نەخشینت هەیە
سێبەری گوێز و چنار و ئاوی کانی و شەنگەبیت
جا بەمن چی تۆ پەنیر و ئاوی بەفرینت هەیە
ئاوی گڕاوی کۆرەکانیت توکی سەرمی هەڵوەراند
هێشتا نالێم ئەی وەتەن تۆ سوچو تاوانت هەیە
تیپی کارگەر ئاشی ئازادی نەگێرێ گەر بەخوێن
بێ سەروپا هەر دەناڵێ خاکی غەمگینت هەیە
(سام) و هێزی کارگەرانە بوویتە کۆمۆنەی فەڕەنگ
قارەکان هەرپێنج دەڵێن تۆ نەجمەیی خوێنت هەیە

## بمری نەفرەفە

بۆ یەکدی کوشتن بە ڕۆژ و بە شەو
بە خەنجەران و شمشێر و بڕنەو
بۆ یەك دەخوێنن بۆ بەند و قەفەس
یەك ڕادەکێشن وەك خاسیەتی کەو
من و تۆ وا لە ناو کوردان
بۆیتە خوێن ڕێژی و دەست لێکتربەردان
پارچە پارچە بوون لەبۆ پاشکەوتن
بوون بە خەیاڵی ئەوا لە مەیدان
هەرچەند یەکەم بوون لەبۆ ئازایی
بەڵام ناکۆکی و فەرقو جودایی
ژیانی ئەوەی خستە (سامەوە)
وا ئێوەی بردە ناو ناتەبایی

## خوایە هەژاری نەزان

یا خودا هەروا بێ نانو ئاوبن
سوتاوی ڕۆژی لەبەر هەتاو بن
ئاگری هەژاری نەرمتان بکا
هەتا یەك دڵ و بیر و بڕوابن
تا هەژار نەبن خەباتی ناکەن
دەبێ سەر شۆڕ و هەر شل و خاوبن

بۆیێ دوعاتان لێ دەکەم ئەمن
چونکە نامەوێ لە بەند و داوبن
هەژاری نەبێ لە کارگەی دڵتان
دەبێ دڵ وەکو شووشەی شکاوبن
(سامی) بۆ ئێوە و ئێوەی خۆش دەوێ
پێ ی خۆشە هەموو هەروەکو (ماو)بن

## لەلای من وایە

لەسەر یەك بڕوا خەباتی گەلان
دەبێتە چابونی قاراتی جیهان
خەبات بوو بەیەك نیشانە وغاییە
چیە ئیسرائیل و ئەنگلۆئەمریکان
هەرچەند لە مێژووش پاشەرۆژ دەبێ
کە بێتە کایە بۆ گشتی ئینسان
خۆ ئیحتیکارات دەبێ بڕوخێ
بلێ رووخاوە و هەردەبێ وێران
بەلاّم پێویستی سەرشانی گەلە
خەباتی بۆ بکا بۆی بێتە مەیدان
تایبەتی چینی هەژار و برسی
بووینە خۆراکی لۆرتی وەك گورگان
هەرچەند گوتی تیان شوعەرا و ئەدیب
(سامی) گوتیەوە و واخستیە سەرشان

## ناخ

بۆ لاوێکی نەبەردم یەک رەنگ و دڵ بێ گەردم
گەل پەرست وەک بارزانی لە شاخ و دار و بەردم
خوێن و گۆشتی رەگەز بێ خۆڕاگر و نەبەزبێ
بۆ کوردان بێ مەبەست بێ چوست و چالاک و مەردم
دڵ خۆش و ژیرکاتەوە دەرکەی مێشک کاتەوە
بۆ گەلی بیرکاتەوە، بۆئالای سۆرو زەردم
نەڵێن کورد بێ کەس ماوە دەست و ئەژنۆ داماوە
وەکو شێر ڕاوەستاوە لاوەکانی هاودەردم
دەم بەستی و دەست کاتەوە وەک (سامی) هەستکاتەوە
بیر کەوتو وڕاست کاتەوە لە رێگەی مافو قەردم

## هاواری نیشتمان

دەنگێ دێت و وا دەڵێ وەرن لە هاواری من
گەر نەمگەنێ بە زوویی بەخوا دەرچوو کاری من
وەرن ئازادی بکەن، دیلە رزگاری بکەن
رەحمێ بە حاڵی بکەن تێنییە گوڵزاری من
ئەوی مێژوو دەڕوێنێ ئاوی بدا بە خوێنێ
ئەگینا با نەیدوێنێ ئەو دڵی بێماری من
رۆڵە دەیبینم بەخوا ئاوی بەفرینم دەڕوا
بۆ بێگانە و ئەو دەیخوا میوەیی گوڵزاری من

هەرچەند زێڕ و گەوهەرە پڕ لە مسك و عەنبەرە
فێنك و پڕ سێبەرە خاكو بەردوداری من
هەرچەند لە تۆم نۆرییە هیچم لەبۆ تۆ نییە
بۆ دوژمنت رۆییە جۆگەوو جوباری من
كێ هەیە چاری بكا بیگاتێ و یاری بكا
بێ تۆ تیماری بكا قەلبی برین داری من
ئەی لاوانی بەكاری بۆ خۆت وەرە خەمخواری
زوو بینێژن خوێنخواری لەحەوشو دیواری من
كێ خاكی خۆی خوشدەوێ نەنوێ بە رۆژ و شەوێ
گیانی شیرینی نەوێ ببتە عەلەم داری من
(سامی) پیری كوردانە مەردێكی مێژوو زانە
وەك مستەفای بارزانە ناو دڵ و ئەفكاری مَن

## دەبینێ داخۆ

وا چرای مێژووی ژیان هات وا لە قاران هەڵكرا
مردنی زۆردار و خوێنمژ هاتە كایە و حەلكرا
وا ملی پەیوەندی فاشی هەر بە خوێنی پەلكرا
نابێ خوێنی لاوی مێژوو لەو پەلەی بڕژێتەوە
وەك چرای یەزدان لە ئەفلاك چۆن بەخۆی دەكوژێتەوە
مۆری حوڕ و سەربەخۆیی وا لە مێشك و ناو دڵان
هەڵقە ناونووسرا بە خوێنی سوری گشتی رای گەلان
كەوتە گەڵ كاروانی مێژووی میللەتانی وەك مەلان
دەفرێ بۆ كوێستانی ژین و ژینەوەی پڕ شادمان

چــینەکانی ژیـــن لـــە تـــەنگیو ئـــاوەدان بـــوی نیـــشتمان
(ســـامی) کـــانی دوژمـــنی گـــەل رۆژی گـــۆڕی خـــوێن ڕژان
دێنـــــە مەیـــــدان بـــــۆ ژیـــــانی چـــــینەکانی مێـــــژووزان
چـەنگ بـە خـوێن وەك شـێری برسـی دەستەدەسـتە لاوەکـان
دێـــن دەڵـــێن ئـــازادە میللـــەت شـــێر لـــە ســـەگ نارەوتـــەوە
جـــادەون بـــە دوژمـــنی گـــەل هـــەر بـــەخوو پـــێ ڕەوتـــەوە

## نیشتمان گیانەکەم

هەرچـــــەند ڕەنگـــــین و پـــــڕ لـــــە ســـــامانی
بـــــە نـــــانو دان و میـــــوە و حـــــەیوانی
بـــــەڵام چـــــی لـــــێ کـــــەم کـــــەرەت بـــــۆ ئاغـــــا
هـــــەر شـــــاخەوانی دۆبـــــۆ شـــــوانی
شـــــوان و گـــــاوانی هـــــەر لـــــە شـــــەوێنان
هێـــــوێنی کابـــــان رۆژ و شـــــەوانی
گـــــوڵ و گـــــوڵ خونـــــچە و گەنەمـــــە و وێنجـــــە
بەرهـــــەمی زۆری نەوبـــــەهارانی
هـــــەژاران بـــــێ بـــــەش بـــــۆ زۆردارانـــــە
دڵ ئـــــارامی نـــــاو مێـــــر خـــــوزارانی
بـــــەبا دەنۆشـــــین لەگـــــەڵ چـــــاوبازان
خونـــــچە چـــــنینی دەم ڕوبـــــارانی
ئـــــەی شـــــوانی بـــــە (ســـــام) ڕۆڵـــــەی شەوشـــــاخان
گـــــورگی کـــــۆزی خـــــۆت بـــــۆ پـــــێ نـــــازانی

## گەر نامانناسی

ئێمه کوردین، دڵ بێ گەردین
بۆ ماف گەل، چوست و مەردین
خوێن دەرژێنین زۆر بەتینین
ڕۆڵەی شاخو دار و بەردین
ئێستا لاوین زۆر بەناوین
فیداکاری زۆربەتاوین
پەروەردەینە یەك پارچەینە
یەك دڵ و بیر و هاودەردین
ڕۆڵەی شاخین زۆر پڕداغین
خوێن ڕژێنی وانەی یاخین
لەژێر ئاڵای بەرز و باڵای
ناوونیشان سۆر و زەردین
خۆ کارگەرین، جەنگاوەرین
چوست و چالاکو تێك دەرین
سەرمایەدار، پیاوی زۆردار
بەهێزی تۆ خۆ نەمردین
خاوەن کۆتی مردی خۆتی
وڵاتی مەت بەبێ قیمەت
بەرد لەبۆ خۆت هێشتا لەبۆت
نەوتی خاوت هەموو بەردین
(سامی) ماوە، ڕۆڵەی کاوە
خوێنی لاوان زۆر ڕژاوە
ڕێ ی خوێناوی لەبۆ ناوی
چرای ژینی بۆ پێ کردین

# قازی محەمەد لەکاتی لەسێدارەدانی دا وتی

راستی لە ئامانج وەرە پێش لاوە
مەترسە گەلت نامرێ ماوە
لەرێی ژینەوەی هەند خوێن ڕژاوە
گوڵی کوردستان دەمی پێداوە
لە چارلا خەبات دەکرێ و لەکارە
لانی شێرانە ئەو بەرد ودارە
نامرێ لەژین هەر بەرقەرارە
مەترسێ لە شێر لەپای قەنارە
باری گرانی ژیان هەڵبگرە
قەدری میللەتت بەگیان ڕابگرە
بە ئاگری خەبات جیهان دابگرە
با سەرت بېڕن بە پاکی بمرە

# بۆ چاوت پڕ نابتەوە

دەوجا بەسەرمایەدار
هەتا کەینێ زێڕ و دۆلار
تا بۆتیشت وابوو بەزێڕ
هەتاکەی زێڕ و زەوی و زار
بەسیە موڵك و خۆتۆخوانی
ببیە یەزدانی ئینسانی
بیبە خاوەنی جەهەننەم
یا بەهەشتی گوڵ و گوڵزار

هەتا کەینێ ببیە زەنگین
لە ژمارەی کوردی غەمگین
ببیە خاوەن جۆگە و جۆبار
شانشین و کۆشك تەلار
ئەوجا بەسە شەرمت هەبێ
بەخوا رۆژەك دەبێ
لاشەت دەرزێو دەتلێتەوە
دەبتە خاك و چینی دیوار
هەتاکەینێ سامێ ناکەی
بەخوا بڕوا ناکەی
بازرگانی پێ ڕەوانی
لە یەزدان و لە دین بێ زار

## نایانناسی

تۆ دەچیە لای ئەوانەی شعور مردەی دینارن
بێ دین و بێ مەبدەئو لە هەژاران بێزارن
لەمەوپێش تێکۆشەر و خەباتکەربوون خەیاڵی
ئێستاکە خەت زیانە چونکی خاوەنی کارن
زۆڕنای بێ ڕێ و هەژاری بۆ وانە بۆ لێ دەدەی
دوژمنی دین و دونیای ئەدەبیات و ئەشعارن
ئەوانە هەر عاشقی زەویوزار و حەدیقەی
رازاوەی وەك بوکانی ناو کۆشك و ناو تەلارن
ئیستعمار دوژمنیانە بە قسە و خەیاڵی نادی

خـــوێن مـــژیش هـــەر خۆیـــانن بـــە خۆیـــان ئیـــستعمارن
ئـــەڵلا ئـــەڵلا خەیاڵـــە فـــڕ و فێـــل لـــە هـــەژاران
سیاســـەت بوویتـــە سیاســـەت سیاســـی وا گەلـــەك زۆردارن
(ســـامی) هەرچـــەند هـــەژاری بمـــرە گەلـــەك باشـــترە
نـــەك منـــەتی ئەوانـــەی وەك دوژمنـــی هـــەژارن

## بانگ

كـــوردە ئیمـــڕۆ ڕۆژی شـــادیت مـــوژدەبێ ڕۆژی نـــەوە
هەســـتە ئـــاڵای شـــێر نیـــشانی زەرد و ســـورت هەڵكـــەوە
ئـــەو زوحاكـــەی كـــاوە كوشـــتی تێپـــەڕی ئێـــستا بـــەخۆت
كـــۆت و زنجـــیری لـــە بـــیرو هـــۆش و دەســـت و پێكـــەوە
ئـــەو چـــرایەی كـــەیقوبادی زابولیـــت پـــێ ی كردبـــوو
جەیـــشی یۆنـــانی كوژانـــدی هەســـتە زووبـــەپێی كـــەوە
بـــۆ خـــەبات و ناوونیـــشان چـــوویە ناوئـــەمن و ئومـــەم
بـــۆ پلـــەی ژینـــت لـــە مێـــژوو دەم ببەســـتە و دەســـت كـــەوە
بـــەو خوێنـــەی كـــورد ڕژانـــدی و دەیڕژێنـــێ بـــێ تـــرس
چـــونكە مـــاڤ لابـــە خـــوێن و تـــۆپ و لولـــەی بڕنـــەوە
لانكـــی حـــاجی دەژێ وا قـــانع و كـــەی پێـــشەوات
پێـــت ئـــەڵێن ڕێ ی گـــەل ژیـــانی دەركـــە هەســـتە وێ كـــەوە
ڕاپـــەڕە ئـــەی لاوی زانـــا(ســـامی) تاكـــەی نیـــشتەجێت
وا لـــە لانـــوێر ومێـــشك گـــەردەن و ناوجێتـــەوە

## بڕوابکە

ئەمن کوردێکم لە کوردی فەقیر
بە بیر و مێشك لە کۆت و زنجیر
لە بەندی زۆردار لاشە لە ئازار
لەڕێی لاوانی لە کوردانی ژێر
لە ڕێی ئەوانەی لە ڕێگەی خەبات
خوێنیان ڕژاوە لە جەرگەی وڵات
ئەوا بیستراون بە خاوەنی ماف
لەناو ئومەم و ڕۆژئاوا و هەڵات
هەر لەو کوردانەی بەخوێن ڕژاندن
لە بەندیخانان زنجیر پساندن
لە شاخان هێرش هەروەك پڵنگان
مەردانە و بێ سام بۆ حەق ستاندن

## ئەمن

بەچکە کوردێکم لە کوردی عێراق
وەك مار پێچ دەخۆم کوشتومی مەراق
لەتاوی وەتەن قەومییەتی خۆم
حیلفی پۆت سدام بە خوێنی دەشۆم
باخچە و بەراوی وەك گوڵزارەکەی
جوتیار و ڕەنجبەر زەوی و زارەکەی
کە ڕۆژ لێی دەدا لەو ئەرزی ڕەنگین

لە میوەی تەڕی و گوڵی یاسەمین
مەدحی پێ ناوێ خولاسەی کەلام
بڵێن جەنەتە وەك داروسەلام
کە هاتیتە بەر بەرەنجی هەژار
زەوتیان کرد بەخوێن خوێنمژ و زۆردار
ئەو خائینانەی دڵ پیس و غەددار
دەیکەن بەپار و لوقمەی ئیستعمار
ئازادی دەکەین هەر بەخوێنی گەش
سەری خائینان دەنێینە ناو هەش
ئەوا ئازاد خوا غەمی دەنۆشن
بۆ تۆ ئەی وەتەن گەلێ بەجۆشن
ترسییان نییە لە گوللە باران
لەسەر ئەساسە ڕێگای هەژاران
ئێمە کە کوردین لەگەڵ براکان
هەژاری هیندی و ئەنگلۆئەمریکان
غایەمان یەکە و خەباتیش بەپێ
بەیەك عائیلە ئەدیترێن بەبێ
شکو گومانتان وەهابێ وەهان
ڕەوڕەوەی مێژوو دەڕوا بێ وچان
هەتا قۆناغی بێ تەبەقاتە
لەوێ حەل دەبێ جێگای وەفاتە
قوناغی پێنجە غایەی(سامی)یە
لەگشتی ئەزرا پڕ ئارامی یە

# ئایار

جەژنەیە جەژنی گشتی کارگەران
لەناو کارخانە و دنیای هەندەران
وایەکدی گرن یەك بیر و بڕوا
لە جەرگەی گەل و جێگای کارگەران
هاوار و شیعار دەژێ لە ئاسمان
بە نرکەی تۆپیش لەناو سەنگەران
گرمەی قومبولان وا بەدەنگی ماف
دەنگ دەداتەوە و خاوەن هوننەران
ئەی دەنە مێژوو مەکتەبەی ئومەم
چاپی ئازادی و مەرد و نووسەران
لە ڕێی مەبدەئو ژینێکی وەك یەك
بۆ بێ کاری گەل خانەی بێ دەران
بەزمی ئایارە چینی ڕەنج خوراو
لە مەیدان بۆ ژین هەربە خەنجەران
سەرکەوت هێزی چینی خوێنمژراو
لەسەر فاشیست و بڕوای نۆکەران
دەبێ سەرکەوێ هێزی وا بە(سام)
بە پشتی خودا و گشت پێغەمبەران

## ئاوی کانی سوربوین

ئاوی کانیان و خوێنی لاوی کورد
تێکەڵ بوو بە تۆپ لاشەی لەتلەت کرد
ئەو لاوانەی وا لەرێی نیشتمان
قوربانی دەدا و گیانی بوویتە پرد
ئەو کوردانەی وەك چاویان هەڵدێنن
سەخین بەخوێنی خونیان دەرژێنن
بۆ ژینی مێژووی کورد و کوردوستان
لەشکری دوژمن وەك شێر دەشکێنن
(سامێ)کی ناکەن لە فرۆکە و تفەنگ
لە نیوەی شەوان هەروەکو پڵەنگ
هێرش دەبەن بۆ دوژمنی سەرشۆڕ
جەژنەیە لایان چوونە ئاگری جەنگ

## کاسلم چۆنە

هێمنی عالەمی بەژیان چابوونە
نەك ژین بەو ڕەنگەی دەکەس هەبوونە
هەژاریش برسی بێ کارمایتەوە
ئەوا ڕەش و ڕووت زەرد و زەبوونە
ئەو سولحە شەڕە بیری لۆرتانە
قسەیەکی قۆڕ و بێ سەروقونە
شەڕێ بۆ ژیان سەت قات چاترە

لەو هێمنی کەوا لە ژمارەی خوونە
لەبۆ خوێنمژی فاشست و عادی
وەك مۆشیدەیان هەر بەناو جونە
دەنا هەر لەوۆرتی ئەنگلۆ ئەمریکان
ئەو لۆرتانەی وەك لەرێ دەرچوونە
ئەو سولحەیە وەك عەمری ئیسرائیل
درێژ دەکا و گشتی تەهدید و جوونە
سلمیشیان دەوێ خوون دەمژن بێ (سام)
لە قسە و گفتوگۆ درۆزن و دووڕوونە

## گیانە بۆ بەقسەم ناکەی

سەربەرزکەن چاو هەڵێنن بەخوا مافتان نادەنێ
وابە سستی و دەم دەمانێ ڕێگە دوورە و نایگەنێ
ئەو کەسە ڕاستە دەڵێ حەق مەردە بێ ترس و نەبەز
وەك لە ڕێگای نیشتماندا گیانی شیرن دادەنێ
ڕۆژ و شەو دایم خەریکی ڕێز و چینی میللەتە
کفنی خوێنین کاتە بەرخۆ و بەرگی دیلی داکەنێ
وەك پڵنگی شاخی کوردان دوژمنی کورد ڕاودەنێ
چەنگی پۆلایی لە جەرگی خوێن مژ و پاشادەنێ
هەروەکو کاوەی دلێر و ڕۆستەمی مازەندەران
تاجی زێڕی خوێن مژان و تەختی زوڵمی ڕاقەنێ
(سامی) وەك سامی نەریمان شادلێری سەر زەمین
خوێن دەڕێژێ سەربەخۆبێ خوێن نەبێ گوێ ی نادەنێ

# کچێك بە لاوێك دەڵێ:

ئەگەر لاوێکی وشیار و ژیری
سەرنجێك بدە چینی فەقیری
کوردی بەجێ ماو هەژار و لەتلەت
کوژرا و دەکوژرێن بەبێ زەمیری
لە بەندیخانەی بیگاناندا وا
دەناڵن وا لەناو کۆت و زنجیری
زۆردار و خوێن مژ دەبا پێکەوە
بۆ چارەسەرمان بەڕاو تەگبیری
پیر و زاناکان بدۆزینەوە
چی تر نەکوژرێن بە تفەنگ و شیری
دوژمنی برسی بەدانی کوردان
مێشکت بکەوە بۆ چ وابێ بیری
بەدیلی مەحتی خاڵ و ئەگریجان
شەرمە لە بۆتۆ چونکە ئەسیری
ئەمن کچێکم پۆلایی لەڕێی
ئازادی میللەت نەك وەك هەویری
شل و شاو وەك تۆ لاوێکی بێ (سام)
لە بەندو داوان وەکو نێچیری

# کیژم

بە چاوی تیژ و بەدڵی پاکت
بە تێکۆشان و بیری ڕووناکت
سەرت بڵند کە ئەی کچی زانا
بنۆڕە شاخ و سامانی خاکت
ئەو خاکەی کەوا کەلێی خوڵقاوە
ئارەزوی باب و لاشەکەی داکت
دوژمن دەسوڕێ وا لە پشکنین
مێشك خۆرانی پۆڵەی زوحاکت
بۆ ڕاکێشانی هەست و بڕوا و بیر
لە کانگەی نەوت و دانو خۆراکت
لەگەڵ لاوانی کەوا ناترسێن
ئازادی خواهی مەردو چالاکت
هەستە تێکۆشە ئەی کچی ژیری
میدیا و پاشای ناودار و تاکت
(سامت) لە دڵی دوژمن هەر ماوە
میراتی لاوی مەرد و بێ باکت

# به خوا باوکم

خوێن مژ و خوێنڕێژ خەیاڵیان خاوە
بناغەی زوڵمی کامەیان ماوە
قەسری ڕاخشتاغ یەکەم قەسر بوو
ئێستا وەك ئاشی ئاو لێبڕاوە
هیتلەر و گۆسینگ فرۆکە و رۆمێل
پەیمانی شەڕیشی داسووتاوە
وەك گەنجی قارون هەرەمی رەییان
بۆ سیاسەت کردن ئاساری ماوە
هەروەك هەلاکۆ تاتار و رۆمی
خانەی سەلجوقی تەپی و ڕماوە
وەکو قومبلەی زەڕڕەی ئەمریکا
لەیابانی دا و دەنگی دەداوە
گەلانی هەستان تابمرن بۆ ژین
ئەستون دەیچەماند خایمەی هەڵداوە
ئەوا بەخوێن و بەقوربانی دان
بۆماف ستاندن پەیمانی داوە
دەڵێن یا مردن یا ژین سەربەخۆ
هەر لە رۆژهەلات هەتا رۆژ ئاوە
ئێستا لە(سامی) هێزی ئازادی
قەلەق ماو دەستی لەئەژنۆناوە

# لە کچێکی مەردو ژیر

مامۆستی مەمکم لەگەڵ کورد پێیم دەگۆ خۆدور بەدور
نرخەکانیم پێ بڵێ تۆ دێمە پێشی بێ قسور
ئەو وەرامی چی دەداوە بەو لەپی شیرینی خۆی
دەیگۆ بەسیە گێژ و وێژی وانەزانی شێتو شور
ئەو مەمەم واپڕ لەشیری کۆرپەیی کوردان دەکەم
ببتە لاوێکی نەبەز بۆم تا بڕێژی خوێنی سوور
بۆ گەلی ئازاد و خاکی هەروەکو کوردی دلێر
بێ خەو و خۆڕاگر مەردبێ چووست و چالاك و جەسور
شەرمە بۆ تۆ هەر لە باسی زوڵفی خاو و دوو مەمی
یان خەباتی پڕ درۆ بۆم لێدەدەی زۆڕنا و بلوور
خۆم ئەوەی بەهرامی گۆڕم شاهو شاهی دینەوەر
حیلەوان و هەربە هێنو شاری مەرگە و شارەزوور
من کچێکی مەردی خاکی پڕ لەژین و ژینەوەی
(سامی) عەودالم بە پەیمان خەنجەری جەرگی غرور

# براگیان

به بسکی شۆڕ و پرچی تێك ئاڵاو
ناگاته کاروان کوردی بەجێماو
بۆ مێژووی گەلان کارگەی زەنگینی
لە کشتوکالی ووشك بووی بێ ئاو
ناچێته ناو خاکی بەرەو شین بوونی
بە بارانەوە رووبەرووی هەتاو
کارگەمان نەبێ و تازەنگین نەبین
پێشکەوتن نابێ و نابیینین بە چاو
هەژاری بێ کەس بێ کارمایتەوە
تێر نابێ گەلی برسی و لێقەوماو
ئەوانی دەچن بۆ ناو ئەستێران
بێ بسکو سادەن وا بێ پرچی خاو
راستی پێشکەوتن کارگە و پارەیە
لەگەڵ یەکێتی و زانینی تەواو
چاو لەبێ گانا و بۆ کیمیا و فیزیا
بەرەو رۆناکی هەنگاوبەهەنگاو
بڕۆن چاترە بەرای زاناکان
نەك بەکارێکی بێ قازانج خوڵقاو
قەراری(سامی) وا هاتە نامەی
پێش چاوی گەلی مافو رەنج خوراو

## جەناب

بەسیە خەیالات بەرگی ئازادی
لەبەر خۆت بکە بۆ رۆژی شادی
شادی هونەرە بۆ هونەرمەندان
نەك خەیالاتی بۆشی ناو نادی
مەی و خەیالات دەبێتە بەندو
دیلی بێگانان برسی و بێ زادی
دەستی خوێنمژ و خۆپەرستانی
پەناوپێچانی لەبۆ فەسادی
ناو گەلی کورد و دەلالی کردن
بۆ دینار پەرست لەبۆ هیمدادی
ژیان و ژینەوەی زۆرداری بەخۆ
بێ(سام) بمینێن هەر بە کەسادی

## لەگەڵ ئێوەمە

ئەی لاوی مەردی سەربەرز و دڵخۆش
لە لوتکەی شاخی کۆسرەت و هەڵگۆش
وەك کانی خوێنت ئەوا دێتە خوار
روو لەگوڵزار و باخ و مێرغوزار
بۆ ئاوی داری حور و ئازادی
بۆ گەل بەربدا بڕژی بە شادی

خوێنی ڕژاوتان ڕوو لە باغانی
بۆ گوڵ شین بوون و بۆ شەبەقدانی
ڕوو لە جۆباران ئاودێری خوێنن
دەبێ لە مێژوو ناوتان بخوێنن
وا خوێنتان ڕژاند بۆ ژین بە مەردی
خوێن بوو بە شاهید پێشمەرگەی کوردی
کوردوستان بۆیێ(سامی) هەرماوە
بێ ژمارە خوێنی لاوی ڕژاوە

## ئەمن

هەرچەند کچێکم وا دەڵێم بەدەو
لە مێژووی ژین دا خاوەنی پێڕەو
شەرمی ئینسانی‌و ڕێ ی عیلم و خەبات
هەتا میللەتم هەستێنم لە خەو
لەرێی ئەو گەلەی پارەپارە بووی
حازری بکەم بە خەسیەت و خووی
وەك قەدەم خێر و فاتیمە و دەرسیم
مافی خۆم دەوێ و کەمتر نیم لەجوی
سەربەرز و دڵپاك هەروەك خانزادی
باتاس و هەریر لەرێی ئازادی
شاهی خاوەر و پاشای روانتوس
دەرچوون لە دیلی بۆ ژینی شادی

کچێکی سەربەرز و پڕشەرتو پەیمان
عاشقی گەل و خاکی نیشتمان
وەك شێخ سەعیدی بێ سام لە مردن
سێدارەی فاشی و سووتان و خنکان

## دیسان

کچێکی تازەمە بیر و دڵپاکم
بۆ پارێزی گەل ولاتو خاکم
وا لە خەباتم هەر بەبێ وەستان
لە کوردی مەردی چوست و چالاکم
گڕی خەبات و سۆزی نیشتمان
بۆم هەڵگیرساوە و دەرون ڕۆناکم
کۆرپە نیشتمان کچو ئامۆزام
لاشەی مامەکان باوان و داکم
کیژی ئەو خاکەم بەچکەی شێرانم
پەروەردەی دەستی داکی زۆرچاکم
گیان و ژینمە گۆڕمە کە مردم
جل و بەرگمە خوان و خۆراکم
بڕوا بەهێزم نەبەز و ئازاد
لە کوشتن بێ (سام) بێ ترس و باکم

# بۆ بوونی یەکێتی قوتابیان

ســـــوپاس ســـــەت ســــوپاس بــــۆ ئــــەو خودایـــــەی
خـــــوێن بــــوو قوتـــــابی تــــۆی هێنــــا کایــــەی
یەکـــــــدی گـــــــرتن و ژیــــــــان و ژینـــــــەوەی
بـــــــڕوای یــــــەکێتی و زنــــــدی بوونــــــەوەی
لــــــە بــــــۆ خوێنــــــــدن و ڕێ ی ئــــــــاوەدانی
پێـــــــشکەوتنی کــــــورد مێــــــژووی ئینــــــسانی
هــــــەر عــــــیلم و خوێنــــــدن پــــــەیامتان دەبــــــات
بــــــۆ هــــــەبوەکانی کــــــەون و کائینــــــات
خوێنــــــدن یــــــەکگرتن ئــــــەی ڕۆڵــــــەی شــــــێران
دەتــــان بــــا بــــۆ مــــانگ بــــۆ نــــاو ئەســــتێران
یــــــەکگرنین بۆیــــــێ پــــــەرش و مــــــل کەچــــــن
دەنــــــا کــــــەمترنین لەوانــــــەی دەچــــــن
ڕۆلانــــــی شــــــێرن هــــــەر یەکــــــدی گــــــربن
تــــا هــــــەر لــــــەژین دا زانــــــا و نــــــەمربن
بخــــــوێنن لــــــە ڕێ ی ئــــــازادیوو ڕزگــــــار
بــــن بــــە مــــــەرگی زوڵــــــم و ئیــــــستعمار
پــــــەنجا ســــــاڵە وا چــــــاوەڕێتانە
لــــــە ڕێ ی یــــــەکگرتن لــــــە بنپێتانــــــە
ئاوتــــــە خــــــوازە ســــــامی لێقــــــەوماو
یــــــەك بوونتــــــان بــــــبێ و ببینــــــێ بەچــــــاو

## ئازاری دووەم

یانزەی ئازارە، یانزەیی ئازار
چونە نەورۆز و گوڵ زاری بەهار
ئومێدەوارین خوێن نەڕژێتەوە
ببێ بە مەرگی خوێنمژ و زۆردار
گوڵوکی باغان بە خوێن شین دەبوو
ئاوی خونچان بوو لەناو لالەزار
بەفر و خوێنی سور سوخمەی قەندیل بوو
گوێچك کەربووبوون لە ناڵەی ڕووبار
لەباتی باران ئاگر دەباری
لە کانی شاخان خوێن دەهاتە خوار
گەل فرۆش بێ(سام) بچتە گۆڕ نەوەك
کوردوستان بدەن بە زێر و دینار

## ڕۆلانم

خوێندنە میللەت ببینێ و چارە بۆ بێ چارەکان
دیل و سەرگەردان خەلاسکا زوو لەسەر سێدارەکان
خیرەت و مەردی ببەخشێ و پایەداری لاوی کورد
کۆشکی خوێن مژ بێنتە ژان و زوڵمەتی زۆردارەکان
جەهلە سەرچاوەی نەزانی و زیدی میللەت پەروەران
چوونە بەرگی خۆفرۆشی و پیاوی لۆرتی هەندەران
خوێندنە بڕوا لە مێشك و ناو دڵان جێگیر دەکا

چـەك لەشـان بـۆ مـاف كـورد و چـونە شـاخ و سـەنگەران
عیلمـە گیـانی ئـادەمیزاد سـولحی رۆژئـاوا و هـەلات
چارەسـەر بـۆ چـینی برسـی و ئـاوەدانی نـاو ولات
زەرپە بـۆ ژیـانی گـەلان و نـان و دانـی میللـەتان
جەهلـە وەك شـێران نەرانـدی و پاشـی وەك رێـوی هـەلات
(سـامی) بەسـیە چـاو هەڵێنـە دوژمنـت وەك گـورگی هـار
وا لـە كـۆزی كـوردی مـەردت هاتـە بـاغ و مێرخـوزار
تـۆ هەتاكـەی وا لـە خـەودای بـیر و هۆشـت وون دەكـەی
شـەرمە بـۆ تـۆ گـەر ئـەدیبی خامـە بێنـە دەسـت و كـار

## نێوەی نەبەز

بـە خـوێنی ئێـوە گـوڵی ئـازادی
شـین بـوو دەمـی دا بـۆ مـوژدەی شـادی
سوپاسـتان دەكـا بـە لاشـە و بـەزار
خـوێنی پێشمەرگەی لـە دەم دێتـە خـوار
چـونكی بەوخوێنـە ئـاوی دراوە
هـەر بۆیـێ خـوێنی لـەدەم تكـاوە
دەیكـا بـە باغـات شـاخ و دێمـەكار
ئـەو خوێنـەی رژا لـەناو بـەرد و دار
ئـەو پێشمەرگانەی كـە قـەت نابـەزێ
وەك كـوردی خـائین قـەت دانابـەزێ
ئـەوەی لـە شـاخان مـەردە و مایتـەوە
لەئـەمن و ئومـەم دەنگـی دایتـەوە

هەرچـــــەند لــــــە دەشـــــتێ پێـــــشمەرگەی ولأت
ناســــــران لەلایـــــــەن رۆژئـــــاوا و هـــــــەڵات
پێـــــشمەرگە خـــــۆی و لاشـــــەو و نــــاوی
بووینـــــــە ئـــــاوی دەم گـــــولّی خوێنـــــاوی
زۆر بـــــە(ســــام)تــــرن لـــــە لەشـــــکری ســــور
بووینـــــــــە جـــــــــەللادی زۆردار و غـــــــــرور

## گیانی پاکت

ئـــەی شـــەهیدی شـــاخی کـــوردان گیـــانی پاکـــت هاتـــەوە
خـــوێنی لاشـــەی خـــۆی ببـــینی کرفـــە کـــرق کاتـــەوە
بـــۆ نـــەمامی داری ئـــازاد بلّقـــە بلّقـــی خـــوێن دەکـــا
فاتیمـــە نـــوری و قـــەدەم خێـــر پێـــشەوا مـــەحمود نەبـــەز
دیّ چـــرای وەك رۆژی روونـــاك دەربخـــا و پـــێ کاتـــەوە
هـــەروەکو ئـــالأی بـــە ئەشـــعار حـــاجی باســـی لێـــدەکا
وای تەمایـــە بـــی چـــەقێنیّ بـــۆ گـــەلی هەڵکاتـــەوە
ئـــەو دلّـــەی ڕەنجـــاوی لاوان وون بـــوە و بیبینتـــەوە
بێتـــە کـــاروانی خـــەبات و تـــا دلّـــی ژێرکاتـــەوە
شـێت و کـەر هـیچ و نـەفامن ئـەو کەسـانەی وەك بـەفێلّ
کـورد دەشـێلیّو بـیر و بـڕوای لاوەکـان لێـك کاتـەوە
پاشـــەرۆژی بـــابو داکـــی چـــاو بەفرمێـــسك بلّـــێن
چـاکە شـاعیر بیرنەچـیّ قـەت سـامی هەربیرکاتـەوە

# کچە کوردێکی مهاباد

کچە کوردێکی خەڵقی مەهابات
کوڕە کوردێکم بەبێ پەنابات
هەرچەند ناتانم بێم بۆ دیدەنیت
لێم عاجز مەبە دڵم ئەوا هات
ئەگەر جەزیری و ئەگەر بۆتانی
گەر کوردی ئێران ئەگەر تۆرانی
منیش کوردێکم ڕۆڵەی کوردانم
وەك تۆ لە شین و دەرد و هیجرانی
وەك مەم لەبۆ زین لە جەزیر و بۆتان
هەروەك پەروانە حازر بۆ سوتان
لەگەڵ لەیلایێ لە شاخی کوردان
هەر دەناڵێنم هەتاکو فەوتان
سامی کە کوردە ڕۆڵەی خۆتانە
بەڕۆژ و شەوێ هەر لە هیجرانە
دەڵێ ی فەرهادە لەتاوی شیرین
وا لەناو شیوەن دڵ پەرێشانە

# بۆ نیشتمان خەبات کەن

ســــەربڵندکە بیرکـــــەوە بــــیر بـــــۆ یـــــەکێتی میللــــــەتت
نیـــــــشتمانی وەك بەهەشــــــتی پارەپـــــارە و لەتلـــــــەتت
وا لـــــــە دەســــــتی دوژمنانــــــە تێبکۆشـــــن رۆژ و شـــــەو
چـــاو هەڵێنـــــە و ببپـــسێنە کـــوت و زنجـــیر و پـــــەتت
رۆژی خەباتــــــــە خـــــــەباتت چـــــاوەڕێتە نیــــــشتمان
کـەینێ هەڵدەســتی و لـەبۆی دێــی کـانی هێـرش و هەڵمـەتت
خـــوێنی ســـوری لاوی ژێـــرە بـــۆ شـــەهادەی مێـــژوونووس
بـــۆت ئەنۆســـێ و دێتـــە دەفتـــەر خـــوێن و قـــەدر و قیمـــەتت
خوێنـــە شـــاعر نامەکـــەت بـــا بـــچتە نـــاو ئـــەمن و ئومـــەم
ببتـــــە شـــــاهید بـــــۆ نیـــــشانە پایـــــەداری شـــــەوکەتت
عـــیلم و خوێنـــە هێـــزی گـــەلت پاشـــی یاریـــدەی خـــودا
بەســـیە نووســـتن و دەســـت کـــەوە بێتـــە جـــەولان غیرەتـــت
چـــەند هـــەزار ســـاڵە لـــەژێر دەســـت مایـــەوە و قـــەت نـــامری
کـــەی قەڵـــەم تـــانی بنووســـێ ســـەربڵندی و عیزەتـــت
هەڵکـــە ئـــاڵای زەرد و ســـووری شێرنیـــشانی قەومەکـــەت
(ســـامی) زۆرە بێتـــە دەفتـــەر خـــوانی نـــاز و نیعمـــەتت

# شوان

بزانم چت کرد تۆڵە شوانی
لە چولو بەنو لە شاخەوانی

لەژێر نرکەی تۆپ فرۆکەی سۆخۆ
لەگەڵ لاوی کورد لەخوێن رژانی

مافی گەلی کورد نیشتمانەکەی
تابژێتەوە وەکو گولیکەکانی

شین بو بەخوێنی بەهار لەزاری
گولان دێتە خوار تا ببتە کانی

ئاودا ئەودارەی کە پێی دەگوترێ
داری ئازادی لەبۆ ژیانی

هەرچەند شوانی وا لە شاخانی
چەند پەیامم نارد وەرامی کانی

سامو هەر سامی بەهەشتی کوردان
من بەرخەوانو بەخۆت شوانی

# ئەوا دەبینی

ئەی گوڵە سورەی بەهار لە دەمدان
لەباغی ئاوی خوێنی پێشمەرگان
لەو دەمی هەنگت کە دێتە خوارێ
دەرژێتە سەرخاك دێنەوە سەردان
سەردانی جەرگی دایکەکان دەکەن
دڵۆپەی ئاو دێ لەزاری خونچان
کاتێ ڕژاوە بە ئاگری ناپاڵ
کردیتیە خاڵ خاڵ بەفرەکەی کوێستان
بووە بەئاوی گوڵی بەهاران
بۆ رازانەوەی خاکی کوردستان
تا لە پاشەرۆژ بڵێن لاوی کورد
خوێنی رژاوە لەرێی نیشتمان
هەموو بەهاران کە دەرژێتەوە
خاکی ئازادی بە(سام)و سامان

# لاوی کورد

بڕۆ بۆ شاخی لەگەڵ وەی زانان
سەرۆك بارزانی داینان بەدانان
ڕۆڵە مەترسە لە بەندیخانان
کۆت و زنجیری دەستی بێگانان
سێدارەی مەرگ لەبۆ ژینی گەل
جێی شانازییە چوونە گۆڕخانان
لاشەت بچێتەوە باوەشی داك و
نیشتمانەکەت تامێژوو زانان
بڵێن لاوی کورد لەو کوردستانە
لەبۆ ئازادی پیر و جوانان
خوێنی ڕژاوە داوا لە لاوان
لە خوێن ڕژاوی خانەوێرانان
لەو بابانەی وەك جەرگی سوتاوە
لەداکی مەردی کوڕ بێ تاوانان
ڕۆڵەی لە شاخان خوێنی ڕژاوە
هەتا کورد بێتە بیر و زمانان
کلیلی دەرکەی زۆرداری بێ شك
بەخوێن دەبتەوە هەمووزەمانان
سامی بنووسە بەپێنووسی خۆت
ڕۆڵەی کارگەر و شوان و گاوانان

# بێچووە کورد

بێچووە کوردێکی خاکی کوردانم
دایم مەلول و چاو لەگریانم
لەو خاکی واخۆش باغاتی رەنگین
بەبێ جێگامە و بێ دەرەتانم
حەسرەتە و مەندم هەر وەکو بولبول
بێ خەو لە ئاهو ناڵەی خونچانم
وەك گوڵی بەیبون زەرد و زەبونم
دائم نەخۆش و دڵپەرێشانم
خەم وەکو زنجیر لە دەست و پامە
وەك باری گران کەوتە سەرشانم
نائومێد نابم دنیا دەورانە
بەڵکو دەبزوێ چەرخی زەمانم
من وەکو مەجنون لەبۆ لەیلایێ
هەتاکو مردن هەر چاوەڕوانم
ئەگەر مردم بمنێژن لە بێوران
چونکی پەروەردەی دار و بەردانم
سامی خەیاڵات بەس بکە جانە
من وەکو شێر و رەقیب جەیرانم

# مژدە لە کوردان

مژدە لە کوردان لە قەوم لە خوێش
تالی بچێژن شیرینی دێتە پێش
قەولی خودایە پێم باوەڕ بکە
بۆ باوەڕ ناکەی ئەی بابە دەروێش
وەك لەداری ڕەق خوێن پەیدا دەبێ
عاشق و مەعشوق پێك دی شاد دەبێ
کە تاڵ شیرین بێ و دار ببێ بە خوێن
شێتە ئەو کەسی لە بڕوا نەبێ
هەر کەسێکی هات لەبۆ سەر زەمین
با لەبۆ خۆشی بۆ زیللەت بچین
بۆ شەخسی بالاّ دو زیللەت هەیە
سامی سەری ساغ مەنێ سەر سەرین

# نیشتمان

خـاکی خۆشـی پـڕ لـە میـوەت بوویتـە گـەوخوێن و دەمـار
گەوهـــەرو کبریـــت و نـــەوتی قسلوگێـــچی بـــێ ژمـــار
مەڕمـــــەڕ و بـــــەردی حــــەلانی وا لــــەبۆ بێگانەیـــــە
سـێوەرە و وێنجـەی شـلێر و بـۆ ئەسـپی ئاغـای پێـچەخوار
بـــێ لـــە ئـــاوی کیلەشـــین و کێـــوی هەڵگوشـــی بەهەشـــت
بـــەفری قەنـــدیلی لـــەکانی و وا لـــە شـــاخان دێتـــە خـــوار
دیمـــــەنی ڕووبـــــار و کـــــانی هاشەهاشـــــی ڕۆژ و شـــــەو
دەچـنە چـۆباران لـە هـەر لا ڕو لـە کـانی و مێـر خـوزار
هـەر وەکـو ڕووبـاری باڵـەك چـۆمی کـەلۆێی پـڕ لـە ژیـن
دەبێتـە کـشمیش گـوێز و بـاوی خۆخـو هـەنجیر و هـەنار
بـــێ لـــەمازی و دارەبـــەن بـــۆ داو دەرمـــان و بـــرین
بـۆ وەرەم گیاکـانی خـاوی بێتـە بـیر و دەسـت و کـار
ســـەعلەب و سرێـــشوکەتیرە جـــاترە و ئەســـپۆن لـــەبۆ
مردنـــی دووپـــشك و مـــار و دڵ گوشـــادی شـــێت و هـــار
لاوەکـــــانی وەك نـــــەمامی ئەرخـــــەوان و شـــــەنگەبین
کیـــژەکانی شـــۆخ و شـــەنگ و دڵ ڕفـــێنی چـــاو خومـــار
هەنـــدە جـــوانێکی بەســـامن ڕێـــك و پێـــك و هاوتەمـــەن
ڕۆژ بـــە ڕوویـــان عاشـــقێکە وا دەســـوتێ بـــێ قـــەرار

# کوردستان

وا شاخ و داخ و بەرد و دارەکەت
چەموو چیمەن و زەوی و زارەکەت
کانی و کانیاوی ناو جۆبارەکەت
هەموو ژیاوە گوڵی پشکوتن
سەمەن پێکەنی خونچە ئەنگوتن
گوڵی دەمی دا هاتە هەژانێ
کەوتە ئازاری مەشکە هەژانێ
فرمێسکە کانی کەوتە ڕژانێ
بەسەر نێرگز جار لە کەند و شاخان
بە گوڵی ئەستێران بوو بە چراخان
گوڵێکی سێوی خونچەی هەناری
شەنگە بی شلی پایەی چناری
بنۆرنە خۆشی کاتی بەهاری
بێ شك و گومان دار (المأوايه)
بەهەشتی نەمرود باغی سەبایە
سەبەینەی فێنك لە دەشت و لانی
بروسکەی گەردوون کاتی شەوانی
کزەی شەماڵ و ڕێژنەی بارانی
مەلەك دێنە خوار لەبۆ کوردستان
بۆ تیماری دڵ هەناسەی خونچان
لەقیژەی قوڵنگ لە بروسکەی بەهار
لە دەنگی قاز و بولبولی گوڵزار
لە کزەی شەماڵ و لە هەژانی دار

بــــــێ شــــــك تیمـــــار و دڵ دەســــــێتەوە
بـــــە مـــــەرگ و لاشـــــان خــــوێن دەرژێتـــــەوە
ئـــــاوی دەپـــــرژێ بەســـــەر خونـــــچەی گــــوڵ
خونـــــــچەی دەم دەدا بــــــۆ ئـــــــارامی دڵ
لـــــە شــــەو تـــــا بـــــەیان چــــریکەی بولبـــــول
دەڵــــــێ خونـــــــچەکەت بـــــادەم کاتـــــــەوە
کـــــــاتی دەم دەدا خــــــــەو دەیباتـــــــــەوە
بــــۆ(ســــامی) شـــــەهێن هاشـــــەی بــــازەوە
نـــــــــــەعرەتی دەدا لـــــــــــــەدەم ڕازەوە
نـــــەك بـــــۆ خـــــوێن ڕژان هــــــەر بـــــەنازەوە
دەڵــــــێ کوردســــــتان لــــــە بـــــۆ ئازادیــــــت
مــــــنم قوربــــــانی بــــــۆ خۆشـــــی و شـــــادیت

## سروشتی کوردستان

بـــــزانن بــــاغی ئـــــیرەم خـــــاکی خۆشـــــی کوردانــــــە
خـــاو و گیابەنـــد و نەســــرین نەخـــشی شـــاخ و کێوانــــە
بـــەگڵ و بـــــەردی نەخـــشینە بـــە گــــوڵزاری ڕەنگینــــە
بـــە کۆســــرەت و ســــەفین و شـــاخی هەیبـــەت ســـوڵتانە
هەنــــدێ ئـــــەرزی قرمـــــزە چـــــیمەنی پـــــڕ نێرگــــزە
لــــەو باغانــــەی پـــــڕ خونــــچەی چــــریکەی بولبولانــــە
هێــــرۆ سەوســــەن و ســــەمبول بــــۆ گوشــــاد نــــابی ئــــەی دڵ

لەناو بەیبونە و کنێر لەو درەختە شوخانە
ئەو ئەرز و کێو و دەشتە دەڵێی باغی بەهەشتە
دەرمانی دەردی وەرەم سەرچاوەی جوگەکانە
خاکی واخۆش و رەنگین باغی پڕ سێوی نەخشین
کیژەکانی حۆریە غیلمانی میرەکانە
ئەی حۆریی و غیلمانی ئاودێری باغەکانی
توخوا سامی بنێژن خۆ هەژاری خۆتانە

## نیشتمانمان

وا زستان رۆیی بەفری لە شاخان
بەعەردی داچوو شل بوو لە داخان
بوون بەسەر چاوە لەناو مێرخوزار
بۆ ئاوی خوخ و شەنگەبی و هەنار
سەرماباری کرد رۆیی بە ئاخان
بە گوڵ ئەستێران بوو بە چراخان
سەوسەن و بەیبوون رازیانەی شلێر
سەریان تێکناوە حاجیلە و کنێر
هەڵوژە پشکوت گەلاز و باوی
سومبول و نیسان گوڵی خوێناوی
دلان خۆش دەکا هەڵقولینی ئاو
مێشك وا دەژێ لەبەر بۆنی خاو
هەواری مەنگوڕ کوێستانی بڵباس

پر لە ترشۆكە و گیارەشە و رێواس
قالۆری درك و شنگ و جاترە
لە دەرمانی گشت حەكیم چاترە
گوڵی رەنگاورەنگ خونچەی یاسەمەن
داری دیدەوان بۆنی دارەبەن
كوزەلەی ناسك لەدەم رووباران
لە گشتی ئاو و گۆشە و كەناران
وا شیلان پشكوت خونچەی بەڵاڵوك
تارایان پۆشی و دەژان وەكو بوك
بای بەهاریش هات هاتنە خوار پەنگر
ماستی مەرە كور هاتە دەر كەنگر
كوارگ و دومەڵان لەخاك هاتە دەر
ئەوا گۆوەند لە شار و لە دەر
بەهاری وا خۆش لەو گوڵستانە
لەلای(سامی) هەر چلەی زستانە

# بەهاری کۆیە

بــەهاری کــۆ چ ڕەنگینــە چــیاو ســەحرای هــەموو شــینە
بــە ڕەیحــان و بــە نەســرینە هــەژاری بۆچــی غەمگینــە
بــە باخــچە و بــاغ و گــوڵزارە بــە کــانی و ئــاوی جۆبــارە
بــە گــوڵزار و گــوڵی ســونبول چــریکە و دەنگــی دێ بولبــول
گــوڵی باغــان دەژێ چــل چــل فیــدای بــێ ســەد قــەڵای بابــل
بــە باخــچە و بــاغ و گــوڵزارە بــەکانی و ئــاوی جۆبــارە
بــــەهاری کــــۆ کــــەڕازاوە ببیــــنن وا لــــە پــــێش چــــاوە
کــە دێ هــاژەی چــەم و ئــاوە ســەبا وەك وی نەخــەملاوە
بــە باخــچە و بــاغ و گــوڵزارە بــە کــانی ئــاوی جۆبــارە
بــەهاری بــەزم و ســەیرانە لــە باغــان خونــچە خەندانــە
لــەوێ بولبــول غــەزەل خوانــە کــە ســامی مــات و حەیرانــە
بــە باخــچە و بــاغ و گــوڵزارە بــە کــانی و ئــاوی جۆبــارە

## خاکی کوردستان

وەخـــتێ خــاکی کوردســـتان بـــەرگی ســـەوز دەپۆشـــێ
خـــاو و گیابەنـــد و کنێـــر داروبـــەرد دادەپۆشـــێ
فەســلی ســونبل و نێرگــز وەخــتی ســوربوونی گــوڵان
لـــەو خـــاکی وا رەنگـــاورەنگ دێ چـــریکەی بولبـــولان
بولبـــول لـــەناو باغـــانی بەخۆشـــی و کـــەیف و شـــادی
دەچـــریکێنێ بـــەبێ غـــەم، دەڵـــێ بمـــرێ فەســـادی
نەســـیم چـــلان دەژێـــنێ بولبـــول بـــە کـــەیف و خۆشـــی
رەیحـــانی دەشـــت و چـــیا ئـــاوی خونـــچان دەنۆشـــی
بـــالایی بـــی و چـــنار بـــە گـــولێکی ســـێو و هـــەنار
بـــێ شـــك دەرمـــانی ســـیلە ئـــاوی کـــانی و مێرغـــوزار
لـــە باغـــاتی تێکـــەڵاو گـــوڵ وەکـــو بـــەفر و خوێنـــە
دڵیـــان لەســـەر دەنیـــشێ، خـــۆش و مێـــشك هەژێنـــە
ســـامی تـــۆ کوردســـتانی لـــەو خـــاکی خـــۆش و گوشـــاد
بۆچـــی دایـــم عـــاجزی جـــارێ نـــاتبینم بەشـــاد

# خاکی کوردان

ئاگری لە دڵی بەرداوم ڕۆژی کەیف و سەیرانێ
محاڵە بکوژێتەوە بە دڵۆپەکەی بارانێ
سێو لە باغان نەخشاوە باغەکانی واساوا
نازەنین و سیساوە شەقڵاوە و لە هیرانێ
سور و سپی خەملاوە، دڵم لەلا نەماوە
کەسک و سور تێک ئاڵاوە لەناو خاکی سۆرانێ
باغەکانی نەخشاوە چیاکان گیابەند و خاوە
لەو بەینە دڵ هات و چۆ دایم دەکا جەولانێ
نەسیم هەناسەی دێنێ خونچەی گوڵان دەژێنێ
ئەو گوڵانەی ڕەنگاوڕەنگ دێنە دەر لە نیسانێ
بەهار فەسڵی گوڵانە چریکەی بولبولانە
عەشقی خاکی کوردانە با عالەم پێی بزانێ
بەهاری وا ڕازاوە سونبولی داو بەداوە
خونچەی سەریان تێک ناوە بێ لە هێرۆ ڕەیحانێ
ئەی لاوانی ئەییوبی عەشقی خاکی کورد تۆ بی
دڵسۆزیت بێ یەعقوبی بۆ یوسفی کەنعانی
خاکت زەردو بێمارە، بێ سەبر و بێ قەرارە
حەپسی دەستی تاتارە، نەگیرا لە مەیدانێ
خۆ(سامی) ئەو شیعرانە هەر بۆ خاکی کوردانە
شاعیر لەتو پەتی کەن مەیلی وەتەن دانانێ

# مەحتی بەغدا

ئارامی دڵان دڵگیر و دڵشاد
بەهەشتە عالەم پێ ی دەڵێن بەغداد
ون بو لەپێش چاو باغ و بەهەشتی
ماضی مەشهور بو بە باغی شەداد
هەر ئەو باغە بو ئێستا بەغدادیە
بەبێ زێدەو کەم باغی سەبایە
ئی بڕوا ناکا عەقلی خەفیفە
خۆیەتی ئیرم و ناوی گۆڕاییە
مەکان و جێگای ئارامی دڵان
مانگی چاردە بوو ڕووناکی ئاسمان
پاریس و تاران شاری ئەستەمبۆل
وەك دێمە کارە بۆ ئێمە لوبنان
وا کەیفی دەکا قەمەر بۆ دیجلە
دڵ لە تەماشای هەر وەکو تیفلە
خۆشیم نەدیوە غەیری ئەو دەمە
دڵ سامی نەما دەرگەی غەم قفلە

# عێراق

ئەرزێکمان هەیە پێ ی دەڵێن عێراق
پارچە ئەرزێکە خۆ لە عالەم تاق
ئەرزێکی واسیع شەرقێتی ئێران
سوریا غەربێتی شیمالی توران
جنوبی کوێتە خەلیجی بەسرە
پارچە ئەرزی مە لەو بەینە سەترە
لە حالی حازر چاردە لیوایە
بەڵام عاسمەی شاری بەغدایە
جێ ی کوردو عەرەب جێ ی دوو قەومانە
ئیدی کەشی هەن کەمن ئەوانە
بەپێی گوتنی ئینسانی واعی
چەند هەزار کیلۆ مەترە پانایی
دەڵێن چارسەت و پەنجا و چار هەزار
پێنج سەتی کەمە گەربێتە ئەژمار
روحی ئینسانی لە ئەرزی مەیە
بێ لە بچوکان دو نەهری هەیە
یەکیان دجلەیە و یەکیان فوراتە
ئاوی وان وەکو ئاوی حەیاتە
پڕ عەجائیبە لە ئاساری کۆن
خەزنەی تەبیعی تێدایە بە طۆن
قوتری شیمالی بەجنوب دەبەستی
لە ناحیەی تاریخ موهیمە دەستی
بە بەحری نەوتە پڕی لە کیمیا
ئێمە موحتاج نین بە دووڕپی دەریا
کورد و عەرەب زۆر لەو خاکە دایە

ئێستا هەموویان وەکو برایە
ئەرمەن و تورك و فورس و ئاشوری
عەرەب و کوردی تێدا بەزۆری
بەمیوەجات و تەعامی تەمیس
نیعمەتی زۆرە بەچەشنی ڕەخیس
بەئاوی ساف و پڕ غەنیمەتە
نیسبەتی خاکی زێڕبێ قیمەتە
پڕ لە گەنم و جۆ لە خورما و ترێ
هەنار و هەنجیر بە ئاوی بەفرێ
بەرون و هەنگین برنج و میوەجات
پایز زۆر رەنگین لەبۆ تەعامات
قارەی ئەمریکا و دووەم ئەوڕوپا
سێ ئوسترالیا و چوارەم ئەفریقا
ئاسیا پێنجەمین هەر پێنجی ئەوان
بە گۆڕینەوە ناکەین لەگەڵیان
لەو خاکە زۆرە بەدرێژ و پانی
ئەمن بۆ نیمە یەك هۆدە خانی
لەو ئەرزە خۆشە حاڵی بزانە
سامی موحتاجی یەك لوقمەنانە

# شاری کۆیە

ئـــەو شـــارە کـــە کۆیـــە بـــە باغـــاتو بـــە بـــەراوە
جـــائیز نییـــە باســـی لـــە تـــەرەف ســـازی هـــەواوە
بـــە ڕەیحـــان و گوڵەســـەمەن و ســـونبل و بـــەیبوون
ئـــاوێکی تـــەبیعی هەیـــە دایـــم لـــە ســـەماوە
لـــە بـــاغ و چـــەمەنی خونـــچە دەژیـــن بـــە نەســـیمی
لـــە چـــڵی گـــوڵی بولبـــولی خوشـــخوان لـــە ســـەداوە
ســـەحرایی کـــە ڕەنگـــین و بـــەهاری وەکـــو بووکـــە
لـــە کـــە کـــۆنی بنـــۆڕە هـــەتا شـــاخی ســـەراوە
وەنەوشـــو کنێـــر و ســـونبول و حاجیلـــە و نیـــسان
نێرگـــز و هێـــرۆ گـــوڵزاری دەژی کـــە بـــەباوە
هـــەر کۆیـــە لـــە ئـــەرزا کـــە دەڵـــێن ئیرەمـــی عـــاد
ئینکـــاری نییـــە هەرکەســـێ بیبینـــی تـــەواوە
ســـاکنی مـــەرد و دڵ گـــیرە گـــەر نێـــرە ئەگـــەر مـــێ
حاتەمـــە هـــەر کـــەس لـــە جیهـــەت بەخـــشش و ســـەخاوە
ئـــەو شـــارە تـــەمامی کـــە گـــوتم ســـائیل و زەنگـــین
بـــێ نـــاوی نییـــە هـــەر کەســـە نـــاودار و بـــەناوە
ســـامیان لـــە دڵا زۆرە لـــە مەیـــدانی شـــەجاعەت
تاقـــەت نییـــە چـــی دیکـــە بڵـــێم چـــەندی کـــەماوە

ئەخلاقی پیاوی کچکە دیارە بەقەد خۆیەتی
پیاوێکی زل غەلەت کا عالەمی رۆ رۆیەتی
مەلێن ئەم بابی دزە ئەولادی دەبێ دزبێ
کردیتتان بەشایەعە گیا لە بنچی خۆیەتی
گەلێ پیاوچاکانمان دی کوڕی وەك جاشی کەرە
هەتا چاوەشیشمان دیت چاکە و زانین تۆیەتی
رێگای عەدل دیارە ئینسانی پێدا دەڕوا
کەر مەسیری نازانی بەلام دەردە جۆیەتی
چەندی سامی باسی کرد قیمەتی هۆشەی نەبوو
تۆشی خستە بن ئەرز و ئەمەش وەرد و شۆیەتی

* * *

مانگ و رۆژ وادەبینن چەرخەچی تولی زەمان
فەصلی چار ئابو ئاگر هاتوچوی ئەستێرەکان
ئاخری کەی دێ زەمانە چی بڵێ ی فیکری نەزان
هاتوو چوون چەرخی گەردوون تا بەکەی دەخولێتەوە
کۆن و نوێ چۆنە یارەب کەی دەبێ بڕێتەوە
وەك بە وردی نۆڕیمە حەزرەتی شێخی مەزن
خستمە خانەی شەریعەت گورگە لە پێستی بزن
وسکتیان لێ کردیە وەکیلی دینی فاخیر
بەخۆشیان وا دەبینن بەزۆری جەردە و دزن
تەسبیحی دانە دانە و دەنکی گەورە و تاکو جوت
وەکو قشپلی وشتر بۆ دۆشینی روت و قوت
خۆجاهیلیش نازانن سامی حاڵی پەشێوە
دەیبینی حەزرەتی شێخ ورچە لە پێستی گاجوت

* * *

ئەوا پیربوویم کەلکم براوە
لە عومری گەنجی پشتم چەماوە
دڵ دابین نابێ بێ ناوچەوانیم
غەیری بێ بەختی چیم لە چی ماوە
خۆشی دنیاییم نە کەم بو نە زۆر
غەیری خەم نۆشین لە قەومی خۆ خۆر
با بۆ خۆم ڕاکەم نەك سەگێ بمخوا
دەچم بۆ خۆشی و لە خەم دەچمە ژوور
لە سامی جەهل ئەمن چانابم
بچم میوانی کەللەیی شابم
ئەو لە هاتووچوون من لە هاتووچوون
حوکمی نەماوە من بە گەدابم

* * *

حاڵی هەروایە ئەو دنیای دوونی
مازی و موستەقبەل بوونی و نەبوونی
بە غەیری ئەمە چی تر شك نابەم
هەردوك زیللەتن بوونی زەبوونی
تا دەوڵەمەندبی تەمەعکار دەبی
دەرحەق بە عالم گورگی هار دەبی
هەرچەند فەقیر بی فەقیری زانا
بۆ تۆ واباشە کە بێ چار دەبی
لە بێ چاریتە شوکری خوادەکەی
بەزەختی نەبوو ئیشی چا دەکەی

ئەگەر زەنگین بێ سامت نامێنێ
خودا عالیمە تۆش بڕوا دەکەی

* * *

شتێك نەزانی بڵێ ی دەزانم
دەبیە کەرێکی فەوقی کەرانم
بێ وەی بارت کەن خۆت دەچیە بن بار
کەر کەی گوتیتی شێری مەیدانم
کەسێك زانایە شتێك نەزانێ
دەبێ بە زانا بڵێ ی نازانم
کەواتە سامی هەر زانین باشە
وابۆت مەعلوم بوو لەناو دوانم

* * *

لەپاشی شرك جەهل و نەخوێندن
دەمانخاتە ژێر نینۆکی مردن
قسەی پێغەمبەر بەجێ نەهێنین
بێ درۆ نەیکەین فیعلەن بە کردن
کارمان کراوە بە هیلاك دەچین
بخۆین و بنوین ئێمە لەبۆ چین
دەبێ بۆ عیلم جدی حەولدەین
گەر لە مەشریق بێ یا مەغریب زەمین
لە ئاینی مە ئەمری پێکراوە
کولی حەقیقەت بێتە پێش چاوە

پێ لە حەق نەنێن پێی کافر دەبین
ئەدی بۆ ئیسلام وا بەجێ ماوە
عیلم ڕێ نادا دەمم ببەستم
گەر بمخنکێنن دەبێ پێ ی هەستم
بەڵکو شاد ئەبم بە موژدەی قورئان
لە سامی عیلم بێ هۆش و مەستم

* * *

قسەی موختەسەر پێت بڵێم مامە
هەزار قال و قیل یەکیان تەمامە
تۆ قەولی درۆ بەچی دەزانی
ڕاستی یەکێکە ئەویش سەلامە
با من بۆت بکەم باسی قسەی ڕاست
ئەمر بەچاکی قەولی خودامە
لەتال و سوری ترش و تیژ دەبی
کەلامی شیرین قازانجی عامە
مەخلوق بەزۆری لە خواری پسان
دائم پڕ چەتە و ڕێگەی بەسامە

* * *

لای فەقیری و بێ نان و بەرگ
بەلای گەورەتر دەبین بۆ مەرگ
ژین بۆ مردنە مردن بۆ ژینە
دێتەوە جێ ی خۆی یەسقان و جەرگ

هــــەر لــــە خـــوا بکـــە ســــامو مناجـــات
هــــەر خـــوا دەتـــوانێ خەلاســـت بکـــات
شــــێخیش وەکـــو تـــۆ خـــۆی لـــێ قەزایـــە
بـــچتە جەهەننـــەم تـــۆ بـــۆ کـــوێ ببـــات

* * *

تەماشـــایەکی ئـــەرزی بکـــە هـــەی کاکـــە مـــەلا
هەنـــدێ بـــووە بـــە مزگـــەوت، هەنـــدێ بـــوە بـــە خـــەلا
هەنـــدێ بـــووە بـــە درك و هەنـــدێ بـــوە بـــە لـــووڕك
هەنـــدێ بـــووە بـــە ســـومبولێ هەنـــدێ نێرگـــزی شـــەهلا
عاقـــل ئەمەیـــە لـــەم کـــارە بزانـــی بـــەزانین
قـــودرەتی بنـــایی قەدیمـــە حـــاکمی عـــەدلا
بزانـــە کـــە زانـــابی بـــەزانینی حەقیقـــەت
جـــێ ی ســـامە بترســـی جبـــل و وەقتێکـــی کـــەڕەملا

* * *

خـــودا چـــیم لێقـــەوماوە بـــۆ بـــەختی مـــن دامـــاوە
وەکـــو پیرێکـــی ســـەد ساڵی بـــە گـــەنجیم پـــشت چـــەماوە
چـــەمیوم میـــسلی گۆچـــان کەوتمـــە نـــاو دەرد و غـــەمان
وەك داری دێمـــە کـــاری لـــە چـــیا و چـــۆلا ڕواوە
لـــە چـــار فەســـلان ســـووتاوم نـــەماوە قـــوتی چـــاوم
زســـتان لـــە بـــەفر و بـــاران هـــاوین لەبـــەر هـــەتاوە
بـــەهاوین لەبـــەر هـــەتاو وەکـــو تـــەیری پەلـــشکاو
لـــەتاوی هیجـــری یـــارە خـــواردن و خـــەوم نـــەماوە

لەتاوی دەردی یارم نەخۆش و دەردەدارم
هەر دەم عاجز و مەلول فرمێسکم وا لە چاوە
ئەویارە قەد عەرعەرە سەروە یا سنەوبەرە
زوڵفی چین چین دێتە خوار کە یەك یەکو بەداوە
داو بەداو دێتە خوارە وەك خونچەی نێو بەهارە
دەمی ڕووی دادەپۆشێ دەمێ پەرشو بڵاوە
دەڵێن سامی کوژراوە تیری موژەی لێدراوە
قاتیلی من بناسن پەنجەی سوری خوێناوە

* * *

بێ کەس و تەنیامە و هەژار و بێ دەرەتانم
بەفیدای سەگی دەرگەتە دڵ ڕوحی ڕەوانم
بیبا کە ئیتر سەگی دەرگەیی حەزرەتی لۆلاك
هەرچەندی کەوا سەرزەنشتی پیرو جەوانم
نامەوێ بە یەقین نەبەهەشت و نە جەهەنەم
هەر هەندە دەڵێم ئۆمەتی تۆمە بە زوبانم
گریەی لەدڵم ئاتەشی عیشقە بەحەقیقەت
عەشقی سیفەتو دیدەنی ئەو فاصل و شانم
ئەی دڵە چاکی ئەمەیە ئەمری بخەیە مل
زانیمە کە بێ زار و گوناهکار و نەزانم

* * *

یـــەك نوقتـــە هەیـــە کـــە ئـــەڵێم بـــە نەســـیحەت
بنـــــوارە بـــــە مێـــــشك زۆر چـــــاکو بـــــە دیقـــــەت
دیقـــــەت کـــــە بـــــەوردی زۆر وردە لـــــەلای مـــــن
خـــۆش و شـــیرین و جـــوان و زۆر بـــە تەبیعـــەت
یـــەك بڵـــێ کـــافری سەرشـــۆڕ مەکـــە بـــێ دەنـــگ
پرســـێکە بـــە عـــیلم و چـــاوێکی شـــەریعەت
ئـــاخۆ چ دەڵـــێ ی چـــۆن رێـــی داوە کـــە جاهیـــل
ببێتـــە قوتـــب و بـــەوەلی و پـــیری تەریقـــەت
عادلـــــە ســـــامی خوداوەنـــــدی تـــــەعالا
جنـــسێتی نـــادا نـــە بـــەفیل و نـــە بەقیمـــەت

* * *

کاکـە گیـان گـەرمێ نـەبێ تـۆ چـوزانی کـوڕ نێـرە
کـوڕ نێـر و کیـژ مـێ نـەبێ ئـەرز بۆچـی زەنـوێرە
لەبـەر خەراپـەی نـەبێ کـەس لـە چـاکەی نـازانێ
بـە برسـی بـوون نـەبێتن نـازانی حـاجی تێـرە
خـوا لـە هـیچ کـەس ناترسـێ کـە چـاکترین حاکمـە
ئـەمری بەچـاکەی کـرد و خـەلقی کـرد شـەڕ و خێـرە
بـرام خـواردن و خواردنـەوە ئیمتیحـانی ئینـسانە
ئـەوانی قوڕئـان نـەزان سـەد برسـی و یـەکی تێـرە
کۆرپـەی سـاوا پیرنـەبێ کـانی حورمـەتی گـەنجی
بەواسـیتە خورشـیدە شـەوقی مـانگ و ئەسـتێرە
فـەقیر حـەبیبی خوایـە ئـەما فـیری ئازایـە
سـامی کـە سـادی و نـەبوون دەبیـنن چـەند بـێ خێـرە

* * *

مــــن فـــــەقیر و دڵ حــــەزینم بــــۆ هــــەژاریم خەمــــدەخۆم
ڕووت و برســــی و دەردەدارم ســــاڵی جــاریٚ خــۆم دەشــۆم
صــــابونم گلـــــە حـــــەمامم دەچـــــمە نــــاو مزگەوتـــــەوە
هــەر بــەنینۆك پــارە پــارە و شەقــشەقم كــرد قــەلبی خــۆم
خـــــۆم بــــــسوتێنم بەســــــوتان بــــا بــــسوتێم چــــاترە
لــەو ژیانــەی وابــە تــەنگی حەســرەتی یــەك نانــە جــۆم
رایــــەخم ئــــەرزو ســــەرینە پێخــــەف و چــــەترم ســـــەما
بــیٚ رێـــو و جــیٚ و دڵ حــەزین‌و بــیٚ دەرودیوانــە خــۆم
رۆژ و شــەو دەرد و فــیراق و دەســت لەســەر دەســتی بــەتاڵ
خـــۆ ئـــەرز زۆر و فەراحـــە مـــن لـــەكۆییٚ بـــۆ نـــەڕۆم
پـــڕ دڵـــم دەرد و مەراقـــە ئـــەو مەراقـــە و پـــیٚ بڵـــێم
لــێم گــەڕێن توخــوا ڕەفیقــان كوشــتەیی حــاجی ســەگۆم
غـــەدری مامـــــە زاڵمــــەكانم داخــــی وان ســــەرباریيە
زوڵمــی وا كــەی ئــەو تەریقــەی بــۆ دەدەی هــەی مــامی خــۆم
هـــەژاری و دەردەداری تاكـــەی دەنۆشــــی ســــامی یــــە
تــۆ فــەقیر و بــیٚ مــەكانی قــەت مــەڵیٚ مــن خــەڵقی كــۆم
كاســــبێكی فـــەقیر و بــــیٚ تـــەكلیف و گـــەدا خــــۆم
كـــەر قـــوڕ و بـــارم ســـوكە كـــەنانی دیـــنی نـــاخۆم
مــامم بـــەخۆ بەتەكیـــە بەجوببــــە و بــــە ملـــی پــــان
مـــن بـــەخۆم و دەســـتگا بـــە چـــەند پـــەڕێكی دیـــوان
چـــۆن ســـامی لـــەمن دەكـــا ئـــەو قـــوتبی عەبـــدالانی
مــن لــە زانــین مــەحروم بــووم ئــەو پێــشكەوت بەنــەزانی

* * *

زەمان هەر زەمان ئینسان دەگۆڕێ
زانا هەر وەخت کەلێ ی دەنۆڕێ
دەیبینی ئینسان کە خۆی خەراپە
چاکەش گەوهەرە و کەلێ ی دەدوڕێ
زانین بۆ ئینسان خۆی رازاندەوە
لقی گوشادی وا هەستاندەوە
جەهل واپیربوو کەلکی بڕاوە
فیکری شاعیری وا حەساندەوە
ئەوا بەینێکە سامم لێ دەکا
هێزی نەماوە و پشتم تێ دەکا
پێم ناڕەزایە و پێی ناڕازیمە
ئەوا پێ ی دەکەم، ئەویش پێم دەکا

* * *

ئیرادەی وابوو لە ڕۆژی ئەزەل
من لەغەم نۆشین سپی کەم سەد قەل
بە دیتنی ئینسان ئینسانی تەمبەل
کە شکوڵ لەملی کا بۆ نان و بەصەل
تەسبیح چەپ و ڕاست بەرماڵی بە کۆڵ
تەمبەڵ و بەدخو بێ کار و زەغەل
کەوڵی لەبەرکا هەر وەکو بزن
چاوی پڕ کل کا ڕەش وەك پشتی قەل
بە شێت و تەمبەڵ مەڵێن وەلینە
هەتتا کردیتتان بە زەڕب ولمەسەل

بەسیە نەزانی و ئەو کارەساتە
مەبنە میرات گر بۆ گورگ و چەقەل
ئەم سیفەتانە سامیان لێ دەکرێ
ڕێگای ئینسانی پێی دەبێ بەدەل

* * *

نە ئەهلی کۆنە ئەربیلیم بەبێ جێگام و بێ خانەم
نە بۆ ساکینی ئەرزێکی دڵی بێ چار و پەروانەم
گەهێ وەحشی گەهێ بەخشین گەهێ پڕدین گەهێ لادین
گەهێ خازین و گەهشازین گەهێ مەجنونی دێوانەم
گەهێ سەرخۆش گەهێ خامۆش گەهێ بێ هۆش گەهێ پڕ جۆش
گەهێ سوڵتان گەهێ عامیل گەهێ کوژراوی موژگانەم
گەهی کوردو گەهێ تورك‌و گەهێ ئیعرابی سەحرامە
گەهێ ئەنگلۆ گەهێ روسو کەزدی جان بنی جانەم
گەهێ قاتیل گەهێ عادیل گەهێ عامیل گەهێ تیفلم
گەهێ بێ کەس کە کەوتومە لەموستەشفائی لوقمانەم
گەهێ ئیسکاف گەهێ پڕلاف گەهێ دەروێش لەزاری خوێش
گەهێ ڕاوچی گەهێ پینەچیو لەپێش کەلبی سحابانەم
گەهێ زندی گەهێ مردی گەهی خەوتو و گەهێ وشیار
گەهێ پڕ ئیش لە هیجرەت دا گەهێ ئازادی مەیدانەم
گەهێ واعیز گەهێ باریز گەهێ سالار گەهێ تاتار
وەکیلی تەختی بەلقیس و بیلاتی شاسولەیمانەم
گەهێ زەنگین گەهێ سائیل گەهێ فریادی مەم بۆبەم
کە غەفلەت کەللەیی بەردام لە سامی ژین هەراسانەم

* * *

کەس نەبوو وەك من بەخت سیابێ
دڵی خۆم نەدیت دەمێکی شابێ
لە عەمری دوریم هەردەم لە شیوەن
دەبێ هەر شیوەن بە من ڕەوابێ
خودا بەختی من چی لێ قەوماوە
لەناو بۆتەی غەم دڵم تاواوە
یا کفن و تابوت مەرگی بەهاسان
یا خەلاسم کەی لەوبەلاو داوە
نەمرم یا نەژیم ئەی من بۆچیمە
لە سێبەری غەم کۆڕ و چەمیمە
نەژیم بەخۆشی نابێ بشمرم
قیامەتە یان ئاخر شەڕیمە
گوناهی دنیا و عەزابی ئاخر
عەزابی دنیام بۆ چییە ئاخر
لەپێشی بونم گوناهم نەبوو
ئاگری جەهەننەم هەربوە بۆ کافر
سامی مە یارەب خۆ موسڵمانم
هەرچەند بەسوچ و پڕ لە تاوانم
ئەتو خودایی و ئەمن عەبدێکم
بەسیە عەزابم و واپەشیمانم

* * *

عەیبی خۆیان نابینن بۆ عەیبی خۆیان كوێرن
خەراپ تەرینی ئیسنانن هیچو پووچ و گەلۆرن
ئینسان یان لا حەیوانە چونكی وەك گورگی هارن
لە ئینسانی شۆراون كاكە گیان پارە زۆرن
دینیان فلس و دینارە ئیمان وەك تۆزی دەشتی
لە ئیمانی خالینە وەكو داری كلۆرن
لەبێ رەحمی، دەترسێ و فەقیر (سامی) لێدەكا
كەلكی دینی ناگرن لەگەڵ یەكدیش خۆخۆرن

* * *

ئیتر تۆم ناوێ ئەی چەرخی گەردوون
تازە بۆ چیمە بونی سەر و قون
تاهەبوم نەبوی كەبوی من نیمە
بەس عەكسی بكە نەك ببیە مەیمون
ئەتۆ هەر قابیل بەدرۆزنەكانی
ئەتۆش وەك وانی دوو قوز و دوو قون
جا یەخەم بەردە من لێ ی راهاتم
قۆناغ هەردووە هەبون و نەبون
دنیا هەر وایە وەك ئێمە دیتمان
هەندێك دەهاتن هەندێكی دەچوون
ئەمن تۆم ناوێ منت بۆچییە
مەمخە گێچەڵ و ناو داوی خاتون
لە سامی وانەی كە باسمان كردن
ئەڕۆن كە رۆیین چون بێ سەر و شون

* * *

بـــــــەعزێ ئینـــــــسان وەهانـــــــە
جـــــا ئـــــــەعمالیان بزانـــــــە
جارێـــــــك دڵیـــــــان نالـــــــەرزی
چـــــــەند ئازانـــــــە بـــــــۆ دزی
بـــــــەعزێك مـــــــەجبوری ژنـــــــە
بـــــــاری گرانـــــــی گونـــــــە
یـــــــا عاشـــــــقی نێربـــــــازە
بـــــــۆ قونـــــــدانیش هـــــــەر ســـــــازە
تـــــــۆ ئەچـــــــێنی شـــــــین نـــــــەبێ
هیـــــــچی نییـــــــە قـــــــین نـــــــەبێ
دەســـــــت كـــــــورت و زمـــــــانی درێـــــــژە
بـــــــۆ چـــــــاكی گێـــــــژ و وێـــــــژە
لـــــــەخوا نـــــــەترس و بـــــــێ ســـــــام
دەشـــــــڵێ مـــــــن وەلـــــــی خـــــــودام

* * *

ئۆبـــــــاڵم بـــــــەملت یـــــــارەبی مامـــــــە
ئـــــــەوا پۆشـــــــیتت جوبـــــــە و عەمامـــــــە
ئـــــــەمن دەناســـــــم خـــــــەڵقی نازانـــــــێ
لەخـــــــەڵقی وابـــــــی مرشـــــــیدی شـــــــامە
لەتەكیـــــــەت زیكـــــــر و گرمـــــــەی دەفانـــــــە
موریـــــــدی زۆرت قەصـــــــابە كانـــــــە
دیـــــــارە تـــــــۆ ئاگـــــــات لـــــــە موریـــــــدان نییـــــــە
وازیـــــــان لـــــــێ هێنـــــــای چـــــــون بـــــــۆ مەیخانـــــــە

ئەتۆی ئەولای محەمەد عەبدال
شەڕت وەك كێو خێرت بە مسقال
پیاوی خوایی مان وەك جەنابت بێ
سامی چی بڵێ زیادە قیل و قال

* * *

پابەندی خەمان کەمەندی کردم
خەیاڵاتیش هات زوو فکری بردم
کەس لێم ناپرسی بۆ فیکرم وون بوو
چەرخی زەمانە توشی چی کردم
پێم خستە خانە و ئاو زنگی حدود
ناڵەباری هات توشی چی کردم
وای بۆ هاو زانای ناڵەباری زان
بۆم بێتە ڕێگا ناچاری کردم
سامی گرتوە هیچ نەشێواوە
ئەگەر هیچ نەبووم ئەی بۆ چی مردم

* * *

ڕەنجە گەر گەنجی هەبێتن باقیش هەر بۆش و بەتاڵ
کامی باشە لێ ی بنۆڕن دزیەتی یاخو حەلاڵ
بویتە سەرمایە و قەڵاتی تا ببینن و بڵێن
غایەتان من بپرسم بیکەمە شیعر و سوئال
چی بوو وا ئینسان بگۆڕێ لوغەت و بەرگی جودا
دەوڵەت و چەفیە و تەوالێت قاپوت و فێس و عەگال

ئادەم و نووح و موحەممەد هەر لە عیسا تا خەلیل
ئادەمن ئەمما رەسوڵن وەکو رەسوڵی زولجەلال

* * *

ئینسانی فیکری مێژوو پێش دەخا
بۆ ژین و خۆشی قووەت رێك دەخا
دەیهێنێتە ناو چەنگ بۆ ئاسن فڕین
رۆژ ئاواو هەڵات بەحەق رێك دەخا
هەر فیکرو عیلمە ئاسن لە ئاسمان
دەکاتە تەیر و لە دەوری جیهان
هاتوچۆ دەکا وا دەخولێتەوە
لەبۆ پێویستی ژینی بۆ ئینسان
ئینسانی فیکری گوناهکارنییە
عالیمی زەڕڕەی خەتاکار نییە
بۆ خۆشی تاریخ مێشك مادییە
نەك بۆ خوێنڕژان چونکی کار نییە
کاکە خوێنڕژان کاری شەیتانە
رێگای حەسوود و جاهیلەکانە
جەهل ئاگرە عیلم وەك ئاوە
سامی جەهالەت مردنی ئینسانە

* * *

دەبێ بۆ عیلم جدی هەوڵدەین
گەر لە مەشریق بێ یا مەغریب زەمین
لە ئاینی مە ئەمری پێکراوە
کولی حەقیقەت بێتە پێش چاوە
پێ لەحەق نەنێن پێی کافر دەبین
ئەدی بۆ ئیسلام وا بەجێ ماوە
عیلم ڕێ نادا دەمم ببەستم
گەر بمخنکێنیت دەبێ پێ ی هەستم
بەڵکو شاد ئەبم بەموژدەی قوڕان
لە سامی عیلم بێ هۆش و هەستم

* * *

لەداخی چیمە چت نووسی قەڵەم
حەکیمی نەزان کەی زانی ئەلەم
یادەڵێن عاشق بەدەردی یارە
بۆی دەناڵێ وا دەردەدارە
نازانن زانیم حاڵی خۆم و کوڕ
قاپم تەڕ ناکا ئاوی لێژ و خوڕ
ئەگەر بەسامە هەر ئاوی مەندە
جێ ی قوڕاویلە مات و بێ دەنگە

* * *

یەك یەهودی و یەك نەصارا یەك ئەڵێ من موسڵمانم
دەزانی من كە دوڕونیم لەدوڕوویی پەشیمانم
وەكو ڕووی ڕەش كەپۆشراوە لەژێر پەردەی نەزانین دا
بەپۆشینێكی پۆشراوە بزر نابێ بەویجدانم
لە ڕۆژێكی ئەكەین ڕۆ ڕۆ بە ئەو ڕۆژە دەڵێن حەشرا
لەبۆ دڵ ڕەش نییە كێشان كە وەزنیكا لەمیزانم

* * *

بەس فیكری بێ جێ بكە بۆ وا خەیاڵت خاوە
دنیای بێ شەرتو بەقا لەبۆ هیچ كەس نەماوە
چەند عالم و پیاوچاكان ئێستا سەرینی خۆڵە
ئەو ئەزری وا دەیبینی ملیارەهای قوت داوە
هەزار صاحب تەخت و تاج سەری خۆیان بەرز كرد
كە ئێستا بوین بە خۆڵ هەر هێسكیشیان نەماوە
هەتاكەی وا كەم عەقلی لێم بوی بە حاجی نێرگز
وەكو دینار پەرستان ئاگات لەخوا بڕاوە
نەینۆك بینە پێش چاوت بەڵكو خۆت ئەبینی
وەكو پیرە گورگی هار پشتت كوڕ و چەماوە
نەفسن قەناعەت ناكا بۆیێ ماڵت خەرابوو
وەك پیرێژنە جولەكە شەرمو حەیات ڕژاوە
بڵێ دنیا دەبینم وەك پەشتەماڵی حەمام
وەختێك حەیات ئەپۆشی وەختێك پێوەی نەماوە
سامی فیكرت بێتە سەر قەبولی ئەوەل ڕۆژە
هەر كەس ئیختیار خۆیەتی ڕۆژی قالو بەلاوە

* * *

## سەیری گەل کەن چاکەون

خزمەتی مردیان دەکەن وا زندیانیش دەمرێنن
پینە دەکەن شتی کۆن خوری و خاراش دەدڕێنن
بازو سەقەر سەردەبڕن لەبۆ شەمشەمەکۆرە
باڵی تەیران دەبەستن بزنە گوڕیان دەفرێنن
پوریٚ بەخۆی ناترِیٚ زگ برسی و بیٚ دەوایە
وازیشی لیٚ ناهێنن بەتۆبزی دەیترێنن
سامیش خوێنی نەمایە پێست و دەمارو گۆشتی
تۆلەو تاژی ناو مێژوو هێسکەکەی وادەکڕێنن

## مێش هەنگوین

هەرچەندی پێوەبدا چاکە هەنگوینی هەیە
زەنگەسورە پیٚ وەدا مەرگ و غەمگینی هەیە
ولاغی ڕەسەن هەرچەندە بەخێوکردنی گرانە
لەڕۆژی لیٚ قەومانیٚ خەلاسکەری ئینسانە
سووتانی پووشی وشک هەرزیلکەکیٚ پێی دەویٚ
ئینسان چا بیٚ یان خراپ ژییانی هەر پێدەویٚ
شەوەت نابیٚ بە ئینسان جێگای پەروەردەی نەبیٚ
هێلکە نابیٚ بە جوجک ئەگەر زەردێنەی نەبیٚ
لەبۆ کوڕ ژن هێنانە کچ مەجبورە شو دەکا
ئی بخواو بخواتەوە چاری نییە گوو دەکا
سامی لەناو ڕاستی دا بیٚ شک قازانجی هەیە
پیسە موو لە ماستی دا گەنجیشی تانجی هەیە

## ئاڵچاغ

پوول پەرست نەبێ پوول خڕنابتەوە
چاو بەخۆڵ نەبێ قەت پڕ نابتەوە
خاك لووورك دەدا هەندێ دومبەڵان
قۆرت پڕ نابتەوە نەرمی کەندەڵان
سەبرێکت هەبێ کۆرپەش دەبتە لاو
دەبتە خاك و خۆڵ کچی بەڵەك چاو
ژینی پڕ لە(سام) نرخێکی کانی
لە ژین و مردن چی لێ دەزانی

## مردن مردنە

کە شەو هات دەنوی وەکو مردی وای
نازانی هەژار یان بەگلەرو شای
کە رۆژ دەبتەوە زندوو دەبیەوە
دەزانی لە ژین ئێستاکەش هەر مای
کەبێ بتانێ نوستن تەرك کا
هەندە نەزان بێ تەرکی بەرگ کا
سەرکەوتن کانی لەبۆ نەنوستن
دەچی بۆ لای کێ چارەی مەرگ کا
خەویش هەر کچو کوڕی مردنە
مردنیش پیشەی ئینسان بردنە
هەر دەبێ بڵێن هیچ چارەی نییە
شتێکە جێگای سام لێ کردنە

## دیسان درۆزن

ئینسانی درۆزن زمانی زۆر کورتە
سەقیل چاو تەنگ و بەپرتە پرتە
هەتا زەنگین بێ دەڵێ هەژارم
وەك مریشکی کورك بەقرتە قرتە
مریشك زۆر باشە بۆ پاسی جوجکان
خەڵاسیان دەکا لەدەستی کتکان
بەڵام کاك سەقیل بوتیە جوجك خۆر
تێر نابێ لە گۆشت هەروەکو گورگان

## زەمانە

هەر رۆژ بەرگێکی لەبەرخۆی دەکا
هەر بەئارەزوو کەیفی خۆی دەکا
دڵی بەبرسی و تێنی ناسووتێ
لەبرسان سیس و وا رۆ رۆی دەکا
ئیمڕۆ کەوا بوو ماوە رۆژێ دێ
چاوەڕێ ی دەکەن لەشارو لەدێ
زەمان لەسامی بۆچی لالوتی
کەینێ هاتە لات نانەکی مەدێ

## بۆ ئاگاداری

سەرت هەڵبڕە بەچاوی مێژوو
بنۆڕە دەریاو شەپۆلەو گێژوو
ژینی چینەکان لەئادەمیزاد
بروسکەی دەدا وا برسیوبێ زاد
لەگەڵ قومبلەو زەڕڕەی شەڕدەکا
نرکەی مەدافیع ئینسان کەڕ دەکا
هێشتا بێ ترسو سامی نەماوە
هەرچەند بە ملیۆن خوێنی ڕژاوە

## سەرۆکی بێ گەل

گەل بێ سەر نابێ سەریش بەبێ گەل
شوانی خەیاڵە بێ زنجومێگەل
نە سەر خاوەنی سەری خۆی دەبێ
نە گەل مزاش و وەردو شۆی دەبێ
نەسەر دەمێنێ نە گەلو نە ماڵ
باسی چی بکا کاک سامی عەوداڵ

# کورد

بێتـــــه گـــــۆڕێ مـــــاف مـــــیرو ســـــەربازی
مێـــــژوو مێـــــژووزان پێیـــــان دەنـــــازی
وەکـــــو شـــــێرانن دەبنـــــه ڕێـــــوی وان
مامـــــه هیتلـــــەرەو لەشـــــکری نـــــازی
خـــــوا دەریـــــان بـــــێنی لـــــه نـــــاوخۆ خـــــۆری
لـــــەناو نـــــەزانین و قـــــین و گـــــەلۆری
لـــــەبیریان بـــــچێ ناحـــــەزی یـــــەکتر
لـــــه هەرکـــــەس بـــــۆ خـــــۆی بـــــۆ پـــــاره زۆری

# پێشوونان

تـــۆز لـــه قـــوڕێ هەڵناســـتێ قـــسەی پێـــشوو تـــەواوه
نێـــره گـــورگ چـــۆن دەزێ لـــەکام مێـــژوودا زاوه
کامـــه زانـــا ئـــەتوانێ بڵـــێ قـــسەت وانیـــه
هـــیچ زیـــانی لـــێ کـــەوتوو ڕژا یـــاخود شـــکاوه
کامـــه پیتـــۆر دەتوانـــێ هیـــچم بـــۆ خڕکاتـــەوه
یـــان بـــیری لـــێ هەڵقـــەنی و یـــان بـــیری پڕکاتـــەوه
یـــان شـــتێکی لـــێ فـــێر بـــێ یـــان بتـــانێ فێـــری کـــا
یـــان پـــاکی لـــێ قـــەزانج و یـــان پیـــسی بـــشواتەوه

## سەرۆکی تەماحکاران

تووکی مەروبزنییە دەیکەن بە جاجمو وخرار
هێزفرۆشتنە بۆ ژین دەکرێ بە کۆشکو تەلار
دەبتە کارگەی گەورۆنە بۆ زەنگی هەنگڕاو
بەکوردی بۆت دەرخەم ئەوەیە بویتە ئیستیعمار
هێزی پارەو سیاسەتو هی پێرەوو لەشکرە
لەیەك بیرو هێزێکە بۆ پێویستی بویتەکار
لەراستیش هەر تەماحە وردەوردە زیاد دەکا
بەڵام بناغەی بۆشە دەبێ برمێ بێتەخوار
چونکە زوڵمو تەماحو زەختو سیاسەتی چەوتە
(سامیشی) زۆر لێ دەکرێ خوێن برژێنێ بە ملیار

## ئەی لاو

ئەی لاوی تازە هەتاکو ماوم
بگرە دوودەستی کوورو شکاوم
ئیمرۆ بەنرخە یاری ئەی جەوان
بۆ پاشەرۆژی نیشانەو ناوم
ئێستا هەژارو چەماوو کەچم
بژیم چەند ساڵێك لەکیست نەچم
پاشی خۆم سودم نابێ لەبۆ کەس
کو حاجی رۆیی منیش وا ئەچم

## زەمانی ئیمرۆ

زەمان وەکو بووک دەڕازێتەوە
گەوهەر لەدەریا دەخوازێتەوە
دەیکاتە مل خۆی مەمکی خڕدەکا
ئەوجا لە نامەرد دەپارێتەوە
سواری خۆی دەکا بەبێ مارە بڕ
دەڵێ کچێکم جوانو مەمك خڕ
بۆ یەکتر باشین دڵداریو زانین
دوژمنن دەبا بیاندەینە بەر تڕ

## شێومرۆك

شێوی بەبێ ئاو هاشەهاشی کا
گەل پەرستی تۆ دانو ئاشی کا
مام بیور چونکی دەسکی لەخۆتە
بپرسە لەدار بۆ تەراشی کا
پێم بڵێ بۆچی بۆ وای بەسەرهات
بۆ ڕەگو دەمار ڕیشەی بۆ دەرهات
بۆخۆی ڕانەگرت دارکەری مردی
بۆ پارچە پارچەی گیانی بەبەرهات

## دنیا پیرێژن نییە

دنیـــــا کــــــچێکە وا دێتــــــە جـــــوانی
تــــــازە دادەنــــــێ بنــــــی مــــــەمکانی
ئەوانــــــەی وتیـــــان پیرێژنــــــە دنیـــــا
پــــــیرو خـــــەڵفاون چــــیان لێ نــــــەزانی
تــــــازە ســـــــینەی خـــــــۆی دەڕازێنتـــــــەوە
لاوی مێــــــــــــــــژوویی دەلاوێنتــــــــــــــــەوە
چــــــاوی ڕەش دەکــــــا پەنجــــــەکانی ســـــور
مــــــــــەمکی خڕدەکـــــــــاو دەیلارێنتــــــــــەوە

## پارەی ئیمرۆ

پـــــارەی ئیمـــــرۆ بـــــەزۆری دەدرێ بـــــەگان و تـــــەلار
نـــــادرێ لـــــەرێی یاریـــــدەی برســـــیو بـــــێ کاروهـــــەژار
تانێتـــــە خـــــوار لـــــە ئـــــەفلاك قـــــەراری پـــــەروەردگار
وەکـــــو خەزنـــــەی قـــــارونی بەئـــــەرزی دا دەچـــــتە خـــــوار
هـــــەر بـــــزانن رۆژێـــــك هـــــات ببتـــــە زەرە پێـــــك دادان
دینـــــارو زێـــــرو تـــــەلار دەبتـــــە عـــــەمرو بـــــەبادان

## مار

چیشی پێمە مار بۆ لە گەزمنە
گەر پێوەم نەدا بۆچی دوژمنە
گەر نزیکم بێ هێمن و بێ زیان
بۆچی دەیکوژم لێی دەستێنم گیان
(سامی) لێ نەکەم پێوەم نەدا مار
بۆچی دەیکوژم دەیدەمە بەر دار

## ئەوە بوو بەچی

هەر بکەو بخۆ هەتا هەزار ساڵ
لەگۆشتی بەرخ و ماچی لێوی ئاڵ
بنو لە سینەی وەك باغی سەبا
لە ڕاموسانی زوڵف و خەتوخاڵ
پاشان دەبتەچی کامی بوبەماڵ
تامی چت لێ کرد شیرین بو یا تاڵ
ئەم ژینە خۆشەو کەیفو ئاهەنگە
لەگەڵ ناخۆشی کاك سامی عەوداڵ

## درۆ ناکەی

ئەگەر دڵسۆزی تۆ ئازابە دەی
وەك جەمالودین محەمەد عەبدەی
سەید ڕەشیدو نەعمان ئەعزەمی
وەك محەمەد کۆیی جەلی زادەی
وەك حاجی قادر ڕەهەندەی وڵات
وەك شاعیر شوکری بێ گۆرو خەڵات

## لۆرت زۆر نارەحەتە لەژینی دنیا

زەنگینی هەنگڕاو لە کۆشکی چەرموك
لە هەنگینی خاو لە گۆشتی نەرموك
شەراب و تەگبیر لە خوێن ڕژاندن
بۆ لۆرتی خۆیان دنیا هەژاندن
لەبۆ زەنگینی و کورسی و مانەوە
خەریکن لەبۆ فتنە نانەوە
نابی بەعەزیا ماری نەخوا
وا قەڵەو نابی سەت جاری بەخوا
بۆ سامی ناکا لە دنیای شەقان
لە قەڵەوبون و ئەستوری و تەقان

## بریا

لە گەشتی دنیا هەموو شارودێ
ئەوچینە دەڕواو چینێکی تر دێ
لەهەر پێنج قاڕات هەرهات و چونە
ئەوی کە دەڕوا بێ سەرو شونە
نە شا دێتەوە نە خاوەن پارە
نە شێخ و مەلا نە ئەو هەژارە

## عالەمی پێشکەوتو

لە دەریای هەوا لە گەڕانن
خەریکی سکەی لە جەودانانن
بچنە گەلاوێژ ناو حەفتەوانە
چمافم هەیە داخۆ ئەوانە
هیندۆکو روسن یانە فەڕەنگن
لە مێژووی ژیان بەنرخ و سەنگن
ئەتۆ ئیسلامی شار وێران کەری
کە دینت هەیە بۆچی نۆکەری
من لەقازانجی ئادەمیزادی
ئەوەی لەکارن بۆعیلم و شادی
دەرۆم و دەڵێم کێ لەژینی تاڵ
ئینسان دەرێنێ خەریکو عەوداڵ

بــــۆ كـــــاری بــــــاش‌و پـــــێش كـــــــەوتنی گــــــەلان
خـــــۆی مانــــــدو بكـــــا هــــــەر ئـــــــەوە ئینـــــسان
بـــــــۆ قـــــــازانجی وان لـــــــــــەرێی شـــــــــەیتانە
زیـــــــانی تـــــــۆ چـــــــاكو كــــــاری یەزدانــــــــــە
(ســـــــامی) ئـــــــــەو قـــــــسەی لا ڕەشـــــــــەبایە
تریـــــــــاكی خـــــــــەیاڵ كـــــــــەڵكی نەمایــــــــــە

## جارەكی نەبو

جـــــــــارەكی نــــــــــەبو بـــــــــیرم كاتــــــــــەوە
لەشـــــــــەو نـــــــــاڵین دا ژیـــــــــرم كاتـــــــــەوە
مەســــــــتی شـــــــــەڕابی زەنەخـــــــــدانیم كــــــــا
یابـــــــــەدوو ئـــــــــەبرۆی ژیـــــــــرم كاتـــــــــەوە
لەســـــــــێدارەم دا تـــــــــەنافی زوڵفـــــــــــان
لاشـــــــــە كونكـــــــــونی تـــــــــیرم كاتـــــــــەوە
یـــــــان بەنـــــــدی بـــــــاغی دوو مـــــــەمكی تـــــــەڕی
ســــــــورو ســــــــپیەكەی مـــــــیرم كاتـــــــەوە
لالوتـــــــــە لـــــــــەمن دڵـــــــم ناداتـــــــــێ
دەبـــــــا حەواڵـــــــەی پـــــــیرم كاتـــــــەوە
(ســـــــامی) هـــــــەژاری بـــــــەژن‌و باڵاكـــــــەت
لـــــــە شـــــــاخی عیـــــــشقی گـــــــیرم كاتـــــــەوە

## یاخوا بهخێربێی شهماڵ

شهماڵ بهخێربێی لهبۆ لای دلآن
بۆ کێت هێناوه ههناسهی گولآن
دهی دهی بهوانهی له شهو نالێنن
یان شادن لهلای ناسكو شلان
یان بهوکهسانهی خهسارهت مهندن
دڵیان له داوان زهلیلو بهندن
یان له باغیدا وا دهوڵهمهندی
عودو تهلارت له سایهی چلآن
فرمێسکی ئاویان له گوڵ دانهبێ
( سامی) مردنیان هیچ لهلانهبێ
تۆزێك وهفات بێو لهخوا بترسه
ئۆباڵی عاشقان بهس باوێ ملان

## چاویان له کورسی نییه

تهختی شاعیران دهریای ئهشعاره
نهك له زێڕو زیوو یان بهردو داره
لهراستی گوتن خاوهن کورسینه
بۆیه یهکی تێر سهتی ههژاره
بۆیه ڕهزیلو جلیان دڕاوه
بهبێ هێلانه و بێ نانو ئاوه
وهك شێری نهخۆش لهناو بێشکدا
له کوێستانی ژین وا دابڕاوه

## ئەحمەق

چــــــی هاتـــــــه دنیـــــا بەناچـــــاری مـــــــرد
بەبـــــەژنی خـــــۆی خـــــاك چـــەند گـــــەز كفنـــــی بـــــرد
بــــــه پاشـــــاو گـــــەدا گـــــشت دەبــــــن بـــــەخۆڵ
تـــــــــەخت و پاشـــــــایی بــــــــوه دەنـــــــگ و دۆڵ
ســـــامی نــــــــەمانی تـــــــەختت لــــــــه دوبـــــــی
ئــــــەو دەنـــــگ و دۆڵـــــه باهــــــەر بــــــۆ تـــــوبی

## نەزانین بەڵایە

هــــــــــەوری نــــــــــــەزانین پڕیـــــــــــشكان داوێ
مەلــــــــەی نـــــــەزانی خـــــۆت مــــــاوێ ئــــــاوێ
هێمنــــــاییم نــــــەدیت لـــــــه ڕابــــــــردی خــــــۆم
هێمنــــــاییم هـــــــەبێ مـــــــن شـــــــەڕم نــــــاوێ
شــــــەڕ لـــــــــه بــــــــەتاڵی گـــــــەڵێ باشـــــــتره
بۆدنكـــــــــه دانـــــــــێ خــــــــۆت مـــــــاوێ داوێ
تـــــــەیری لـــــــه شـــــاخان بـــــــەتۆ نـــــاگیرێ
بـــــــۆ ڕاوی كـــــــــەوان كــــــــەو دەچـــــــن ڕاوێ
چـــــۆن (ســــامی) نەكـــــــەم لـــــەو كـــــاتی نـــــاخۆش
هەنــــــدێ مریـــــــشك خــــــۆر هەنــــــدێ بـــــــەرداوێ

# ئەی رۆژ

رونـاکی و شـەوقت لـەکێ هێنـاوە
ئـەو گـەرمی هـەیتت کـێ بـەتۆی داوە
دەجوولێیـەوە یـان ڕاوەسـتاوی
ئەگـەر نـەجولێی بۆچـی وەسـتاوی
هـەروا لـە بۆشـی چـۆن ناکەوییـە خـوار
خۆتـۆ باڵـدار نـی چـۆن دەگـری قـەرار
بـێ هێلانـەو جـێ چـۆن خـۆت ڕادەگـری
بـەرووناکی خـۆت جیهـان دادەگـری
مـانگ رونـاك دەکـەیت ئەسـتێرەو زەمـین
بـەخۆت چـۆن دەژی بـەژداری لـەژین
چـۆن دەبـێ وەهـا نـەبزووی و نـەخۆی
کـەس نێتـەلات بـۆلای کـەس نـەڕۆی
رونـاکی دەدەیـت مانگانـەت نـاوێ
پـارەی بـەنزین و هێـزی خـۆت نـاوێ
ئـەی واریـداتی مانـەوەت کـانی
کارگـەری لـەناو کارخانـەت کـانی
چـۆن وا دەبەخـشی کەچـی نـابڕێ
کەسـیش ناتوانـێ لـەتۆ دابـڕێ
بـەبێ ئالـەت و مەکینـەو کارگـەر
کـارت هـەروەها چـۆن دەچێتەسـەر
تـۆ هـەر ببخـشی و هیچیـشت نـەوێ
بـەخۆت چـۆن دەژی دانیـشی لـەوێ
بۆنـت لـەکێ بـوو لـەکێت هێنـاوە
بۆقـەت نـابڕێ کـێ بـەتۆی داوە

شتێکی سەیرە دەدەی ناتەوێ
بۆنت بەبەخشین چۆن داناکەوێ
ئەوی تۆ هەتە کەس پێی ناکرێ
هەردانو هەردان تاکەی نابرێ
لە کەینێوە هەی کەینێ خولقاوی
عومرت چەند ساڵە تا ئێستا ماوی
لەرابردی خۆت چت دیو بەسەرهات
ژیانت چۆن بو کێ یاریت دەکات
توخوا پێم بڵێ کەی دەکوژێیەوە
هەروا دەمێنی یادەبڕێیەوە
گەر هاتو نەمای لاشەت چی لێ دێ
چت لێ دەپرسن شەوقت چی لێ دێ
لەو رۆژی کە هەی هەروا ڕاوەستان
نەجولانەوەت بەتوولی زەمان
بەبێ یاریدەو بێ وەستاو شاگرد
چۆن وا ژیاوی خۆت ئەوها ڕاگرت
من واتێدەگەم تۆش وەکومنی
من لە قوژبنان تۆ بێ قوژبنی
بێ پرسو ژمار خێرت دێتە خوار
بۆجنسو ئینسان لەبۆ مۆرو مار
گەورەترین هەبووی لەبوونی کۆن
عالەم دەیزانی بەخشینت چۆنە
بەڵام پێم بڵێ بێ(سام) ونیاز
کێ بەتۆی داوە لێی بکەم داخواز

## باوەم

باوکەکـــــەم لـــــەو دونیایـــــە هەرکـــــەس بۆخـــــۆ بۆخۆیـــــە
قـــــازانجی گـــــشتیت دەوێ، فروفێـــــڵو درۆیـــــە
چـــاکە دەکـــــەین لەبـــــەروەی هـــــەر یەکـــــدی پێبـــــشکێنین
هـــــەرکردەوەو کـــــاری خـــــۆت بۆتـــــۆ دەبێـــــو هـــــی تۆیـــــە
قـــــسەی ڕاســـــتی دەبێـــــژم ڕاســـــتی مـــــان تێدانییـــــە
بـــــۆ ڕاســـــتیش عەمـــــەل نـــــەبێ گـــــووتن چـــــی تێدانییـــــە
بیکـــــەو بڵـــــێ واکـــــردم ناچـــــار بـــــڕوات پـــــێ دەکـــــەم
کـــــردت قـــــسەت تـــــەواوە دەیکـــــەم جێـــــی بڕوانییـــــە

## ئەستێرەکان

ئـــــــەی ئەســـــــتێرەکان بڵـــــــێن ئێوەچـــــــن
وابـــــێ هـــــۆش و گـــــۆش بـــــۆ دێـــــن و دەچـــــن
شـــــعورتان هەیـــــە یـــــان بـــــێ شـــــعورن
خـــــەریکی چـــــنە لـــــە دووچـــــی دەچـــــن
کەوتونـــــە ســـــەریەك بـــــەبێ ژمـــــارە
بەچـــــی دەژیـــــن و دەکـــــەن ئیـــــدارە
لـــــە کـــــەینێوە هـــــەن ئاخیرتـــــان کـــــەی دێ
مانـــــەوەی ئێـــــوە هـــــەر بـــــێ قـــــەرارە

## ئێستا

دیـــن و مەبـــدەء بوویتـــە قـــاز فڕییـــە ئاسمـــان وەکـــو بـــاز
نـــاوی مـــاوەو دەمێنـــێ لـــەبۆ قـــازانجی فـــێڵ بـــاز
وەسوەســـەو بـــێ ئیمـــانی لەناولاشـــەی ئینـــسانی
لەڕاســـتی ڕاگرتینـــە لێمـــان غـــەزری وەك بـــەراز
ژیـــان موحتـــاجی پێـــرەوە هـــەروەکو چـــرا بۆشـــەوە
بـــێ چـــراو دیـــن و مەبـــدەء چـــیت بەســـەردێ بیرکـــەوە

## تێ پەڕی

تـــاج و تـــەختی کـــۆن کـــەوا تێپـــەڕی
کـــەلکی چـــی مـــاوە کـــەوا تـــۆ پێـــی هەڵپـــەڕی
بـــێ خـــاوەنی تـــاج قـــازانجی چـــی بـــوو
بـــاوی هـــەربێ و نـــاوبوونی چـــی بـــوو
لێیـــان نـــاکرێ بەکلکـــە ڕێـــوی
تـــاجی وان کـــانی چـــی پێـــی بپێـــوی
تـــەختی ئێـــستاکە هەتاکـــەی هەیـــە
دەبـــێ بـــەهی کـــێ بۆکـــێ مایەیـــە
شـــێتە ئەوکەســـەی دڵـــی پێخۆشـــە
خـــانی هەوایـــە بناغـــەی بۆشـــە
شـــتێك کـــە (ســـام) و دەردی لـــەدوبێ
یـــاخوا هـــەر نـــەبێ هـــەر بەنـــەبووبێ

## دروستی دەکا دەشی ڕمێنێ

ئەو چاوە جوانەی، ئەوبالاّ شاڵەی
ئەو ڕومەت سورەی وەك پەلکی گوڵەی
ئەو پەنجە نەرمەو ئەو دەمی واتەنگ
ئەو زولفە خاوەی لە شانو ملەی
دەکەی بەخاكو خۆڵی وەك جاران
ئەو ناسکەی بۆ وادەکەی بەو گوڵەی

## شاعیری ئێستامان

شاعیری ئێستا هەرچەند تەواون
وەك شەوچراغو دوڕڕی گەواون
بێ نرخن بەلاّم لەکن کەڕولار
ئەدیبی زانای بێ نانو ئاون
هەندێك دەناڵن بێ نانو برسی
لای هیچ‌وپوچان هەموو گەلاّون
لای سامیش وایە خۆیان وەك سەگن
شاعیریش خاوەن دیوانو ناون

## شاعیرو ئەدیب چ بکەین بابم

هەروەکو فەرخە لەقلەق کەوتە دەستی مندالآن
ناو دەریایی هەژاری و هەراج خانەی دەلالآن
وەك کەلەبابی شەو دەلێین هەستە بەیان هات
کەچی دەمان کوژنەوە بەدرێژی مانگ و سالآن
تا چەقەڵ دوژمن مانە بێزاری دەرنابڕین
قورتەقورتی هەردەکەین لە حەوش و بان و مالآن
باڵوپەڕمان شکاوە کتك جوچك مان دەخوات
سەرمان چوو سامیش نەما مالێش رۆیی بەتالآن

## ئاخ و داخ

دڵە شێتەکەی لێ ڕەنجاوەکەم
کەوتە ناو داوی زوڵفە خاوەکەم
لە داری داوە لە باغی سینەی
لەلای دوخونچەی لێ گوشراوەکەم
یاخوا پێم بدا داری شوانی
لەسەر سامانی گشتی جوانی
شەرتم بێ هەتا رۆژ دەبێتەوە
خەو نەمباتەوە هەتا بەیانی
سامێکی ناکەم لەدەوری بالآی
لەپاسەوانی سینەکەی والآی
هێشك چی دەبم لەگەڵ پەرچەمی
چین بەچینەکەی عەمبەری لالآی

## گەر ئەدیبەیەك

ئەدیبەیەکی بیرودڵ ڕۆناك
خاوەن پێڕەوی خاسیەتو خوچاك
دەبینی ملیۆن لاوانی ئازای
هەربخواتەوەو بنووی بەبێ باك
چبکەم لەلاوی ئازا جوانی
نەزانی نرخی ژینی ئینسانی
بۆچی کچێکی ژیری ژیتەوە
نەکەم بەمایەی خەزنەیی مانی
ئاودێری باغی ئارامی دڵان
باغەوانێکی نەمامی گوڵان
بۆ(سامی) نەبێ لە مێژووی زانین
بۆ بێتە ریزەی کوروبێلان

## ئاگات لەخۆبێ

شەرێکی بێسود هەر بکرێ بەلاش
قازانجی کانی بۆپیاوی قەلاش
شەرێکی بکە هەروەکو دەڵێن
ببی بەمایەی دونانی مزاش
پێشوونان وتیان شەڕ لە بەتاڵی
گەلەك باشترە لەبۆ کاری باش
(سام) لەچی دەکەی لەبێ مەعاشی
نیته فرەشیو شیوەك گەنمو ماش

## مەستی لەیلامە

هەرگیز خەیاڵی ئەستۆنە دڵم
بێ هۆش و کاسی شەوبۆتە دڵم
گەوهەری عەشقی نازی چاوبازە
دەزانی کەوا هی خۆتە دڵم
خەنجەری مووژەی خوێن ڕێژی عاشق
لەتلەتی شیری ئەبرۆتە دڵم
مەلحەمی لێوی شەکەرباری تۆ
چونکی ڕۆژو شەو لەڕوتە دڵم
جگەرسوتاوی تۆمە بێ پیرەو
بڕژاوی خاڵی پشکۆتە دڵم
نازانم کەوا زانیت ئەتۆ
هەر لە هەنگاوی شەورۆتە دڵم
سامی وا باغی سینەکەی سی بات
لەگەڵ باغەوان واجوتە دڵم

## کاکە هیتلەر

لەبۆ بازار و بۆ ڕون و نەوت
ئاگری هەڵگیرساند بۆخۆی تێکەوت
لەشاخی بەرزی تەماحکاریدا
زۆری وامان دیت بەربۆوەو کەوت
کەسێکمان نەدیت لەشەقامی ڕاست
بزربون دەبێ هەرلەڕێی چەوت
هەروەك موسۆلین لەبێ سامی دا
بۆخۆی بەڕوی ڕەش لەمێژوو خەوت

## راستە

سەربەخۆیی بوون وەك جەننەت خۆشە
نەك لەبۆ عەبدان حەلقە بەگۆشە
بۆژینی دنیا خۆت بۆگەنی کەی
ئەو ژینەی بەحری بناغەی بۆشە
ژینی وات لەلاخۆش و بێ دەنگ بێ
من واتێدەگەم نەفەست نەخۆشە
بۆ بێمەبدەئان بۆ بێ دین و هیچ
سەرشۆڕکەی کەوا میللەت فرۆشە

## پێشونان دەڵێن

گۆلکی خۆماڵی هاوسەری دەوێ
نەك بەناو دانی نیشتمان کەوێ
شارەزای پۆش و پاوانی خۆیەتی
شیری هەنسەدەران چۆن دەگاتە وێ
گەر گۆڵك نەیبا وەکو کۆرانە
بێ لەو شاخی وا کاری سەرکەوێ
سامی وسکت بە مێشکت دەردێنن
کاکە گیان چ بکەم دڵم ناخەوێ

## بزانه

ئەو میوە تەڕەی خاوێن و پاکە
دیارە پەروەردەی لە جەرگی خاکە
هەرخاکیش دەیخوا بۆی دەبتەوە خاک
زۆرن لەوانەی دورن لەچاکە
دەڵێن ئیدی خوا بەری ئاوو خاکە
پاش مردن گیانی لەناو ئەفلاکە
ئەدی ئاوو خاك گەر گیانی نەبێ
خواردن و خواردنەوەی بۆچی کەلاکە
گەر پانیان هەیە کاجێی گیانی وان
بۆچ والە بەخشین سەخیو بێ باکە
بەخشندیی گیان جێگەی سەرسامە
چۆن هێندە سەخیو مەردو چالاکە

## دەبێ وابڵێن

حەسودان قەت ناگەن بە مەخسود
بۆچی ئەو قسەی دەکەن بەبێ سود
شتێك هەر هەیە لە قسەکردنیان
عەقڵت چۆن دەبڕێ بەو قسەی روت و قوت
دەبێ لێرەبن تاوانبارەکان
فەرمانی مێڕوو بۆخوێن خوارەکان
دەردی لەسەریان بەبێ بەزەیی
بۆگەلیان دەدا لە سێدارەکان

## ئیمانو نیسك

بەتەمای نیسك لەئیمان گەڕای
بۆیە زەنگین بووی ئەوها هەڵگەڕای
لەبێ ئیمانی وەك شێخی كڕای
لەمێژووی ژین و لەدین وەرگەڕای
وەكو فرۆكەی لەڕاستی فڕای
بەرگی ئینسانیت وەك ڕانكی دڕای
ئێستا وەڕس بووی وە لە خۆت گەڕای
لەرێی ئینسانی ئەوا دابڕای

## یار دیسان

دڵی راكێشام دوچاوی مەستت
ئیشارەی سینەو ئەبرۆی پەیوەستت
ئەگەر نای كوڕی قەستی چت هەیە
بۆچی لێی زیزی بەداوان بەستت
بیخە باغەكەی بۆی لەناڵینە
سەت جار توخوا خونچەكەی دەستت
دەڵێی سامی وس تۆ نایبینیەوە
بەبیرت نایێ جارەكەی گەستت

## خەم لەمن

جەوری زەمانە بیری بەزاندم
خواریو ناکۆکی دڵی تەزاندم
بێ ئیشو کاریو نەخۆشو پیری
سواری سەرم بو لاشەی ڕزاندم
یا خوا کەس نەیبێ موشکیلەی ماڵی
وەرەم وادەژی لە کیسەی خاڵی
هەرچی ئەوانەی هەبێ لە ئینسان
یا خوا هەر سەقیل ببێ بەماڵی
هەبوویو ژن چاك پیربوونی نییە
لەخۆشی دنیا دوربوونی نییە
سامی لاپەشمە سەری نایەشێ
خەمی لەماڵو نەبوونی نییە

## بێ ددان

لاشەت بێ هێز نابێتن هەتاکو هەتبێ ددان
گورگ پیرو گەڕنەبێ نابتە گەمارۆی سەگان
ماڵێك ڕەنجی خۆت نەبێ لەلات بێ نرخ و کەمە
یا قوماری پێدەکەی وە یاخود دەیدەی بەگان
زۆر گۆتن زۆر بەلایە دەبیە سوکو قەشمەرجار
پیاوەتی لەدەست دەبا دەبیە ژنی ئەجننان
سامت لەدڵ نەمێنێ نەخۆشیەکی گەورەیە
تەخسیری ناکەی بەهیچ دەبیە کەری ناو جۆگان

## بەخت

بەختم بەزر بوولە گەردون وونە
مێشك بریندار دڵم کون کونە
بێ مێشك و بێ دڵ چ بکەم لە دنیات
خۆشم نازانم بۆ چ وام بەسەر هات
بەختە ڕەشەکەم خۆت سپی کەوە
گەر پەل بەستەی تۆم بەخۆت بیکەوە
وەك لێی دەنۆڕم ئەوا ڕابردیم
بێ بەشم لەژیان هەروەکو مردیم
هەر بەخۆت سەخیو جێگای نیازی
پێویستیم لەتۆ دەکەم داخوازی
گرتەی عەبدان بم عەبد سامی کا
بەرانبەری تۆ هێزو مانی کا

## نەی نینسان

گـــــەر چـــــاکە ناکـــــەی خراپـــــە کـــــردن
دەبتـــــە دور لـــــەخواو ڕاســـــتیو ڕاکـــــردن
گـــــەر بـــــەخۆت چـــــابی ئـــــەمر بەچـــــاکەی
دەبـــــی بەوەســـــتای حـــــەق بینـــــاکردن
یـــــەخوا نـــــەیبینن لـــــە ڕاســـــتی لادان
ڕەنجبەخەســـــاری و عـــــەمر بـــــەبادان
گیانمـــــان بکێـــــشی نـــــەك بۆگـــــەنی بـــــین
لەهێـــــسك بۆکـــــەر جۆبـــــۆ ســـــەگ دانـــــان
لـــــە خـــــواری کەســـــێك ببـــــی بـــــەدارا
لـــــە فـــــڕوفێڵ بـــــازی نـــــابی بـــــەکارا
هـــــەر وێـــــران دەبـــــی بینـــــای ناپاکـــــت
بەعـــــەقڵی ســـــامی نـــــاکرێ مـــــودارا

## بۆلای برادەر

باتێـــــت بگـــــەینم گـــــەر ڕاســـــتت دەوێ
کـــــەم بـــــڕۆ بـــــۆلای هەنـــــدە مەچـــــووە وێ
ئەگـــــەر هـــــاتو چـــــوی زۆر دامەنیـــــشە
نـــــەك بڵـــــێ هەنـــــدە چـــــی لێمـــــان دەوێ
کـــــە چوشـــــی قـــــسەی زۆر نەکـــــەی باشـــــە
نـــــەڵێن زۆر بڵـــــێو چـــــەنەی هەراشـــــە

هی نەشزانی قسەی لێ مەکە

ئەگەر وانەبێت چونت بەلاشە

با پێشت بڵێم لەبیری مەکە

بەزۆر چونی شت دڵگیری مەکە

لەبۆ ئەو کارە لەناوەندی بە

بەسام قەشمەری بەپیری مەکە

## یارەبی

منەت خەڵق کرد بەتەمای عەبدان

لەدنیا وەهارەتو سەرگەردان

دروستت کردم بۆغەمو دەردان

بمکەی چاو شۆڕی دەستی نامەردان

داواکەم لەکێ چ خودای دی هەیە

خلاسم بکا لە ئاخودەردان

(سامی) چاوشۆڕی هەندە گرانە

وەك کەر لە کاروان کێشانی بەردان

## کەڕاتی باش نییە سامی

خۆت وانەزانو وابێ هۆش مەکە
لە ئینسانی باش حەچەو هۆش مەکە
ئەتۆ لەلای خۆت خاوەن پێڕەوی
کەچی دەبینم سەگت پێ ڕەوی
نەم ماوە قەرار من لە تاوانت
بەرانبەری من زۆرە تاوانت
جارێک لەگەڵ من دوو قسەی خۆش ناکەی
دڵی خەماوی جارێک خۆش ناکەی
لایەک عاشقان لەگۆڕ دەنێژی
لەلایەک گوڵی باغان دەنێژی

## هەروایە کاکە

گەر چڵکن نەبی لاشەت ناخورێ
زەنگینیش نەبی ماڵت ناخورێ
فرمێسکی چاوم وەکو کانییە
وەك گەنجی سورە وەکو کانییە
چونکینێ پولێ دەکا سەرمایە
بۆیێ هاوینان لەلای سەرمایە
لەتاوی بالاّت پیشەم زارییە
ناوی تۆم هەر کات لەسەر زارییە

بۆ جونان دەدەن بەو تازەلاوە
پێ ی دەڵێ ی بچۆ کاکە بەم لاوە
ئەگەر بانەهات لەئاسمانی شین
بۆچی دەکا وەیلاو هاوارو شین
نازانم چ بوو ئەو دەردە لۆمە
هەرچی هەڵبستێ دەمان کا لۆمە
زۆر سەیرە لەلام ئەو لاوە ڕووتە
ئەتۆی خۆش دەوێ عاشقی ڕووتە
هەندە عاقڵ و زاناو بەهەستی
لەبەر کەسێکی نەم دیوە هەستی
هەڕەشان دەکا بەلاّم بەقەستی
بەدڵ وانییە ترسانە قەستی
شەرابی عیشقی خواردووە مەستە
ئەو چاوانەی چەند خومارو مەستە
لەناو شاعیران ئەو قسە باوە
دڵی عاشق وەك پوشە بەباوە
هەندە شیرینە وەك هەنگوینی ڕاو
بەلاّم بۆ عاشق وا دەچێتە ڕاو
لەبۆ عاشقی ڕوی قەستی سەردەکا
چاوی وەك شەهێن دەشتی سەر دەکا
دڵم دانانێ قەت مەیلی ڕابی
پاشی بالاّکەی بادنیا ڕابی
هەزار جاری من جون دەیودەرکەی
وازت لێ نایەنم هەردێمە دەرکەی
دەزانم دڵت هەر دێتە گۆڕان
بەلاّم من دەمرم دەچمە ناو گۆڕان

ئەو هیچو پوچەی بەردە بابڕوا
زۆربێ دەماغە گەلەك بێ بڕوا
لەو کاتی کەوا ڕۆژی ڕووت هەڵات
ڕەقیب وەك گورگ بۆ شاخان هەڵات
ئەو ڕۆژی دیتم کە بوو بە زاوا
دەتگۆ مانگایە وا تازە زاوا
لە یەکێك بیستم قەومێك لە قەومان
وەکو شێرانە بوون لەلێ قەومان
پیاوێکیشم دیت دەستی کردەوە
سولحێکی تێکدا خەستی کردەوە
خۆی ڕاگرتووە دەستی لێ بەردە
دڵت لەگەڵیان وەك دارو بەردە
پێم بڵێن چەند بوو داخۆ پارەکە
باست بۆ کردم ساڵی پارەکە
دیسان بوختانت بۆ پێ کردەوە
کالەو گۆڕیەت بۆ لەبەر کردەوە
سامی هەرچەندە گەل وەستایە
دەستی لە ئەژنۆ لەکار وەستایە

## پسیار لێت

لەبەرچی ئادەمیزاد وا ڕەنگاو ڕەنگو لەتلەتە
نارێکو یەکدی کوژو یەکدی لابێ قیمەتە
یان نەزانو یان زانایان بێ عەقڵو یان دانا
زۆری مەراقی غەدروو یا پەرستی شەهوەتە
هەندێ سپی هەندێ ڕەش یا ڕوو سیسو یا ڕووگەش
هەریەك نەوعە ڕەنگێکو هەزار نەوعە لۆغەتە
هەندێك وەکو بەللورە ئەما عەقڵی ناتەمام
هەندێکی زۆر ناشیرین عەقڵێ زۆر بەشەوکەتە
سامی پسیاری کردوو وا چاوەڕێ ی وەرامە
عاقڵ کەوتە تەفکور نەزان لەلای سوحبەتە

## ڕاست بکا

ئەو یارە ئەگەر بەهەوەس بێتە تەماشا
سەروەتی دنیام بدەنێ نامەوێ حاشا
خونچەو بولبول موتریبو ساقی لەباغی
هەر بایە نەهاتوو ئەویش لێم بووە یاغی
بوژانی زوڵف بۆ چڵو خونچە لەدەم دان
دێتە وێ یارم بەکەیف یادی تی سەردان
بۆ سامییە کاتو وەکو عەمرو بەراتە
موژدەیە بۆی هاتو کە لایق بە زەکاتە

# خەلق شكاندن

هەرچــــى خـــــەلقى بـــــشكێنىٚ غايــــەى خۆهەڵكێـــشانە
ســـوكى چـــۆن گـــران دەبـــىٚ شـــێلميش هــــەر بەكێـــشانە
تـــۆ خـــەڵقى بـــۆ دەشـــكێنى ئەگـــەر بـــەخۆت نەشـــكاوى
لۆمــــەى ئـــەو كەســـەى دەكـــەى كـــەوا لــــە ڕوح كێـــشانە

هـــــى لۆمـــــەى خــــەلقى دەكـــــا وازى لــــەخۆى هێنـــــاوە
زۆر هـــــيچ و بــــــىٚ نمــــودە لـــــەناو خـــــەڵقى شـــكاوە
نـــــاوێكى لــــەخۆى دەنــــىٚ و خۆپێـــشان دانــــى خـــەڵقى
چـــونكى بـــۆ خـــۆى هـــيچ نييـــەو لـــەناو خـــەڵقى بێنـــاوە

ســـامى هێـــشتا چـــت ديـــوە خـــرا تـــر لـــە پاشـــترە
لۆمـــــەى خـــۆت بكـــەى گەلــــەك لــــەهى خــــەڵق چـــاترە
مــــەلىٚ عـــــەقڵى مـــــن ووردە پـــــسيار لـــــە ناحــــەزت بكــــە
هــــەتا پێـــشانت بـــدا عـــــەقڵت لـــەوان شــــاش تـــرە

## خەیاڵ

داخوا زارت شیرین بوو ئەو نانە بەو دۆشاوە
یان تامەزۆری خەیاڵت لەبۆ گۆشتو پلاوە
ڕێوی چۆن دەبێ بڵێ هەر خۆمم شێری بێشەی
مریشك مێلكەی قازی كرد قون دڕانی بۆ ماوە
ئەی هەژارو بێ نانە لەناو ژینێكی تاڵە
خواردنەوەو خواردنو جلی هیچ نییە هەر خەیاڵە
خاڵو سامی چی بكا خەیاڵیشی پێ نادەن
لەناو خەڵقی بێ ڕووەو دووژمنیشی لەپاڵە

## باری هەژاری

هەرچی هەڵگری باری هەژاری
كەوا پێوەیتی ڕێگەكی هاری
هی لۆمەی بكا لە كەرو نەزانە
بۆ خاتری قورئان بەردی لێباری
زەریف تێ بگە گوێ خۆت ڕاگرە
بەرگی هەژاری وەكو ئاگرە
ئاگر هەروەكو ئاو بەكولێنی
هەژاریش هەروا ئینسان داگرە
سامی وازبێنە هەروەكو جاران وەرە
سەر باسی سەر كوڵمەی یاران
ئەشعارت دانێ هەتاكو ماوی
لەسەر بولبولو خونچەی جۆباران

# ئەی قەل

بۆچی هەر وەحشی قەت مالّی نابی
لەدۆستایەتی بۆ حالّی نابی
وەکو مریشك لەگەلّ ئادەمی
بخۆوەو بخۆ زگ خالّی نەبی

قەل دەلّیّ:

بەکوردی بلّیّ وەرە لەبۆ خۆم
لە شیشەت بدەم بەنانیت بخۆم
دانی تۆ ناخۆم لەمالّت نابم
بۆ خۆم لە چۆمان حورو سەربەخۆم
مریشك مالّی بوون لە نەزانیتی
یا لەبێ مێشكو یا بۆ دانیتی
سامت لێ دەکەم چونکی گۆشت خۆری
لێم دیوی بەخۆم دەخۆی بەزۆری
دەچی لەشاخان بەگوللەی گەرم
لەتەیران دەدەی یانە بەتۆری

# عەکسی کردن

بەسیە مام عەکسی پەلاران ماوێ
چاکت ئەناسم هەندەی پێ ناوێ
وەك ئێستری چەمووش جوتکان هەڵماوێ
خۆت ماوێ گێژو ئاگرو گەرداوێ
هەتاکو برژی مردن هەرڕێتە
ئەمن بۆ تۆمە ئەتۆ بۆ کێتە
لای خۆت ئینسانو کاراو تەواوی
مانگی لە چاردەی ئەنگوستی ناوێ
بۆچی لەڕێگاو لە حەق لادەدەی
مانگی جیهانت بۆ بەبا دەدەی
دنیا بە پشتی چێڵان دادەدەی
یان پشتی دەشکێ یاخود بەرداوێ
من لەڕاستی دا گرانو قورسم
بۆ خۆت ڕابردی لەتۆ ناترسم
لەبۆ نەمانی لەکەس ناپرسم
فوو لە ڕۆژ کردن (سامی) پێ ناوێ

## جوانێکی وەها

لەرۆژهەڵاتو ناوەندو ئاوا
مێژووی ڕابووردوی ئوروو نەیناوا
جابل و بابل لەخوارو هەوراز
نەمدی وەك كچی مامەی نانەوا
بەشەرموو جوانو زۆر شل و ناسك
زاناو شیرین وا حەلقە لەباسك
هیچ نەدیتراوە نەكەس دەیبینی
ئێستاكەش نییەو نەش بووە لەئاسك
كراسی خونچەدار وەك لەبەردەكا
چاوی پڕ نازی كەمێك سەردەكا
بەڵام وانییە سامی دەنوێنێ
شەهوەت پەرستی لەدڵان دەردەكا

## گورگ

خەراپەم دڵێن خەراپەم بێ شك
بەڵام لەبرسان نەم ماوە مێشك
گەر برسی نەبم بۆچی وا دەكەم
بەرخو مەڕ لێكدی تەوەللا دەكەم
دەتێرم بكەن هەروەكو كەران
گەر بارم نەبرد لەبۆ هەندەران
هەینێ تێم بەردەن سەگە گوڕیەكان
كە پاستان دەكەن بەهێسكو بەنان
لەوەی ناپرسی خاوەنی چۆنە
هەرچەند پیاو كوژو دزێكی مۆنە

سەگەك مان نەدیت بەدز بوێرێ
یان بە پڵینگێك وە یا بەشێرێ
زۆرجار وادەبێ پیاوی باش دەگرێ
وەیان منداڵێك لەبۆ نان دەگرێ
پیشەیان وایە سەگان بەزۆری
سواڵ کەران دەگرن یان شەل‌و کۆری
یا دەبنە سەگی زینا کەرێکی
دەگرن پیاوچاکو موحتەبەرێکی
چاکان زۆر دەگرن بۆ پیاوی خەراپ
یان بێوەژنێکی فێڵبازوو چارقاپ
سەگیش لەبۆ خۆی چاکی دەزانی
خاوەنی دزە بۆ پاسەوانی
لەترسی خۆیتی وا نانی دەدا
لەماڵ دزراوێك وا هانی دەدا
دەزانی کەسێك نانەکی دەنێ
خەلقی بۆ نەگری ئیتر نای دەنێ
هەر بۆیێ لاتان سەگێك باشترە
لە ئینسانێکی بەپاداش تەرە
چونکە نان دان تان لەبۆ خوا نییە
چاکو خەراپتان لێك بووینە دوژمن
خۆشتان خەراپن بۆ دێنە گژمن
کەیفتان پێ بێ خێری پێ دەکەن
خۆشیشتان نەوێ پشتی تێدەکەن
ئەمەکی سەگو چاکەی تۆ هەردووك
بۆ کەیف‌و نانە بۆکاری چروك
خەراپی خۆتان بۆچی نابینن
لەکاری خۆتان کەمێك ڕامێنن
سەگ بۆ کولێرەو تۆ بۆ غەیری خوا
بەغەیبەت کردن گۆشتی یەك دەخوا

یەکدی دەشکێنین بۆیەك چا نەبن
نەك ڕێ ی خوداو ئەوەی پاك نەبن
لاتان باش نەبی پیاوێکی دانا
سەت پێ باشترە بە سفڵەت دانا
نانی دەدەیێ مەحتوپاست کا
دەنا سفڵەیە نابی پاست کا
باسی مەرناکەن لە سامی گورگان
مەر بەخێو ناکەن لەبۆ بێ بەرگان

## بۆ بانگم دەکەی

گازت ئەکردم دونی هەربەخۆت
بەزمانی شیرین هاتم بە منت گۆت
تا نەسوتاوم لەئاگری عیشق
بێمە دیدەنو سەرحەوزی ئەستۆت
عارەقەی گەردەن بەوێ دا دەڕوا
بۆ باغی سینەو هەناسەی شەوبۆت
چ بون زولیخاو خونچەو پەریزاد
سەت سیمو هوزار لەگەڵ سەمەنبۆت
کارەکەرت بن شیرینو لەیلاش
بە قوربانی دوو چاوو دوو ئەبرۆت
بەخۆوە دوو سێو ئەوجا دەبنە سێ
سامیش یەکێکە بابێ ببنە جوت

# خودایە

یـــارەب تـــا کـــەنگی هـــەژاریو لـــەنگی
وا بـــاری مـــن بـــێ بـــێ هێزیـــو لـــەنگی
بـــێ کـــەلك بـــویم هێـــزم بـــڕاوە
رەحمـــم پـــێ بکـــەو بـــێ گـــۆرە ڕەنگـــی
لـــەناو ئـــازارا نـــەماوە قـــەرار
داوات لـــێ دەکـــەم ئـــەوا بـــەدەنگی
لـــێ پاڕانـــەوە ئـــەی خـــودای مـــەزن
هاســـانە لـــەلات پیربـــوونو شـــەنگی
هەرچـــەند ڕوو ڕەشـــم لـــە دەرگانـــەی تـــۆ
نـــەجات لەدەســـتی دیوانـــو زەنگـــی
(ســـامی) ڕووی لێتـــە تاخەلاســـی کـــەی
لەدەســـتی پیـــسو گـــرژوو دەبـــەنگی

## شاعیرا نمان

مــــــەیلی و ڕۆســـــتەم و ســـــامی ســـــەرگەردان
حـــــاجی و ڕاجـــــی عـــــەلی بەردەشـــــان
ڕۆیـــــن و دەڕۆن جێگـــــای پەرۆشـــــن
هـــــەروەك قـــــانیع چـــــوو لەکیـــــسی کـــــوردان
عاصـــــی و حوســـــێن و صـــــافی هێرانـــــی
عاشـــــق بەچـــــاوی پـــــیری گـــــەیلانی
دڵـــــدارو دڵـــــزار عـــــەونی و جۆبـــــار
پەشـــــێوو بـــــێ بـــــەش حـــــەبیب میرانـــــی
ئـــــەدیب و زانـــــاو شـــــاعیری کـــــوردان
نـــــامرن هـــــەرگیز مێـــــژوو دەیزانـــــی
ساموســـــو پێـــــری گـــــەل و وولاتـــــن
لەگـــــەڵ ماوەکـــــان هـــــەموو پیرانـــــی

هەتا زۆری خوێند زۆرتر کەر دەبێ
وەك ولاغی شێت لەپەت بەردەبێ
چونکی خوی پیس و وەکو ئاویکی
پێشی گیرابێ و لەپڕ بەردەبێ

* * *

نەمدیت ڕاستگۆیەك بیری پێبدەم
ببم بە داکی شیری پێ بدەم
بیکەم بەلاوێك ژیرو گەل پەروەر
بوخچەی نەکراوەی میری پێ بدەم

* * *

خۆتان خۆ مەکەن بەمێ ئاغا بلێ من نێرم
قونتان بگرن تڕ مەکەن میران نەڵێ بەکێرم
ئێوە مەبن بەڕێوی دوژمن نەڵێ من شێرم
تا شەهوەت پەرست نەڵێ لێی گەڕێ پێیان فێرم

* * *

مزگەوتێ دەکا دەبێتە حاجی
جارێک نانۆرتە گەلی موحتاجی
بەڵام پێت بڵێم من بە کرمانجی
لەدەشت و شاخان هەروەکو تانجی

* * *

داوا لە لاوان داوا لە لاوان
پێشمەرگەی نەبەز لە خوێن ڕژاوان
بزانن مۆژدە بە خوێن نووسراوە
بە لوولەی شەستیر هاتە پێش چاوان

* * *

گورگ وا گۆشتی دەخوا زۆر بەترس و لەرزەوە
ئینسانیش هەر گۆشت خۆرە بەو شعوری بەرزەوە
گورگ وا گۆشتی بخواو ئینسانیش هەر وەک گورگ
گورگ بۆچی ناوبەدبێ و ئینسانیش بە تەرزەوە

* * *

ئەی خاکی کوردی خۆش و رووناکم
بۆ تۆ بسوتێم ئەمن بێ باکم
چونکی تۆی خاکی بابوو باپیران
چەنگێکە لە خۆت لاشەکەی داکم

* * *

میللەتێك قوربانی دەربێ نامرێ هەی شێت و شور
چونکی زەنگین و بەنرخە شاهیدێتی خوێنی سور
شەرتو پەیمانە لەمێژوو سەر بە خوێنمژ شۆڕ بکا
ببتە جەللادی غروران گیانی پیسیان گۆڕ بکا

* * *

ئەوی نەزانێ نرخی ئینسانی
هەرچەند نەزانە زۆر چاك بزانی
بێ نرخ و کەمە وەك گورگ و چەقەڵ
درندەی زیانە خۆی نرخی کانی

* * *

بێچوە شێری کورد ملیۆن هەزارە
لادێ خەباتکەر مەردو بەکارە
مەردن پاشە ڕۆژ لەبۆ زۆردارە
چی بێ سەر بڕین بمرێ مردارە

* * *

ئەوی بەرز بو لەخۆی بترسی
بەرببیتەوە لەتەختو کورسی
چونکی لەبەرزی لە چینی برسی
دوور دەکەوتەوە تالێی نەپرسی

* * *

ئەو پارەی دەدرێ بەقەحپەو قومار
خەرج با لە ڕێ ی ئەدەبو ئەشعار
ئێستا کورد لەناو مانگ جووتی دەکرد
چۆن دوژمن دەهات وا ڕوتی دەکرد

* * *

تێکۆشەرێکی رووس هەیە وەك لینینی ناوە
لەناو دنیای ئازادی ناسراوەو دەنگی داوە
دۆست و دوژمنی مێژوو ناسیتی و وا دەیناسی
ئیعتیراف پێ کردوو دەڵێن نامرێ و ماوە

* * *

کەس کەسی هەژار نیە هەژار دەبێ لەبۆ خۆی
ببتە خەمخۆری خوی و خوێن برێژێ لەبۆ خۆی
خەمی خەلقی بۆ هەژار وەك داڵغەی سەرخۆشانە
سەرخۆش نایبا بۆ ژینێك بژی حورو سەربەخۆی

* * *

دەوجا بەسەرمایەدار
هەتا کەینێ زیرو دۆلار
تابوتیشت وا بوو بەزێڕ
هەتا کەی زێرو زەوی و زار

* * *

تەفرەقەی گەوران جەهلی میللەتە
وا بویتە دیلی و خاکی لەتلەتە
سیلو هەژاری و جەردەیی و دزی
گرانیو قاتی و دەردو زیللەتە

* * *

کە من بێ بەش بم لەو خاك و بەرە
چ رۆم زەوتی کا چ ئینگلتەرا
بەمن چی خونچەی باغ و باغاتی
چی لێبکەم هەوای فێنك و تەرە

* * *

کاکە شەفتی و گندۆرە لەماڵی میران زۆرە
هەژار دەبا لەبۆخۆی لێدا زورناو بالۆرە
دەبێ هەر بۆخۆی بڵێ ئەو نانە بەو دۆشاوەی
بچێتە دەریای خەیاڵ با هەریژی بەو جۆرە

* * *

چاو هەڵێنە کوردە گیانە
ئەی پێشمەرگەی چەك لەشانە
لەرێ ی خاکی نیشتمان دا
خوێن چارەی دەردی کوردانە

* * *

زگی شاعیران عەمباری بابی
هیچ کەسێك نییە هەر شتەك چابی
ئەو شتەی دەکا بە شیعرو دیوان
نای شارێتەوە دنیا خەرابی

* * *

دەستەبەدەستە وا ئادەمیزاد
دێتە دنیاوە بۆ چاکەو فەساد
بۆ خراپەی زۆر بەچاکە کەم
هەزاران دڵ تەنگ یەکێك بە دڵشاد

* * *

هەزاری ژەنگە کچی ڕوو بەخاڵ
دەتوێنێتەوە نەکرێ مەشتوماڵ
عەقڵی دەشێوێ یان حەیای دەبا
یان ڕەشی دەکا هەزار لێوی ئاڵ

* * *

خوزیا لە داکم ئەمن نەباما
ئەگەر هەر دەش بووم بۆ خۆم کەرباما
نەك بەو ژیانەی وا بەچاو شۆڕی
بژیم لە دنیا تا دەچمە گۆڕی

* * *

چەرخ ئاشێکە تێر نابێ لەدان
ئینسان دەهاڕێ بەتولی زەمان
بە پاکو پیسو بە پاشاو گەدا
بەڵام پێم بڵێن چی دەکا لە گیان

* * *

بیستو چوار سەعات وەستای لەسەر لاق
بۆ دوو هەناری شیرین بە میلاق
کەچی نەت زانی واتاڵو تفتە
بە تۆ ناخۆرێ ترشە وەك سماق

* * *

لای زانا عیلم چرایە بۆ شەو
هەروەکو ئینسان پێویستە بۆ خەو
لەبۆ گفتوگۆ خواردنو خواردنەوە
عیلمیش وشیاری لە غەفڵەتوو خەو

* * *

ئینسانی برسی مەراقی نانە
عیلمی لاپەشم زوڵمو زیانە
نانی پێ بدا گیانی بستێنە
روح لەلای برسی سوکو هەرزانە

* * *

پرست پێ نەکەن قسەی لێ مەکە
ئەوی ڕووت تێکا پشتی تێمەکە
یاریدەی زەرو درندەی پۆخڵ
هاتە بەر دەرگات خێری پێ مەکە

* * *

فەریبی مەخۆ بەچاوو ئەبرۆ
چوونە ناو داوی مەعشوقەی ئەمرۆ
عیشق خۆی پاکە تۆ پیسی مەکە
خۆت مەدۆڕێنە بەیاری مەکرۆ

* * *

بەمن چی خاکت قسڵو مەڕ مەڕە
وولاتت گشتی گەوهەرو زەڕە
من وا خنکاوم لەو ووشکە دێمە
بەمن چی بزنو بەمانگاو مەڕە

* * *

مەنۆڕنە جوانی عەمەل ناشیرن
بنوڕنە وانە پەروەردەی شیرن
کراون بۆ ژیان کۆڕی ناکۆکی
دەرمانن هەروەك هەنگوینی شیرن

* * *

گوریسم لەبن دنیایێ ڕاخست
بەرم لە حوجرەی تەمامی ڕاخست
دەرگەی ئینسانیم لەخۆم پێوەدا
وەك نەزانو شێت لەسەر خۆم داخست

* * *

لەهەموو شتێ بەخت مان ڕەشە
دەبریقێ وەکوو مەندیلی قەشە
بەلام لە شووتی دەردم ئەو دەردە
وەك مێزەری مام وەستا بێ گەردە

* * *

منت خەلق كرد بەتەماى عەبدان
لەدنیا وەها ڕووت و سەرگەردان
دروستت كردم بۆ خەم و دەردان
بم كەی چاو شۆڕی دەستی نامەردان

* * *

كەمن ڕازی بم بەلەتە نانێك
بۆچی سەر شۆڕكەم بۆ نائینسانێك
گونی قایم كا لەناو چەوانم
دینار پەرست و هیچ و نەزانێك

* * *

گەر هاوین و گەر زستانە
بەشی كەچەڵ هەردوو نانە
بەبێ لێف و بێ سێبەرم
لەگەرمێن و لە كوێستانە

* * *

ڕەژوو بە ئاگرگەش دەبێتەوە
ئینسان بە نەبوون ڕەش دەبێتەوە
هەر بە برسییەتی هاروشێت دەبی
وەك گورگ دەمی بەش دەبێتەوە

* * *

هەتا زانابی شتەك نەزانی
بەبی بە شاگرد ئەویش بزانی
تازانین هەبێ هەوڵی بۆ بدە
زانینە کوشتەی جەهڵو نەزانی

* * *

قسەی واباشە بچتە ناو دڵان
بەهاران بولبول دەچتە ناو گوڵان
بۆ خۆشی قسە گوێ گرتن باشە
هەر وەك ژن دەڵێن زێڕیش بۆ ملان

* * *

فسان وامەچنە لەناو زەهری مار
لەناو ئاگرو سەهۆڵی بەدکار
مەی چنە لەناو غازی ئینسان کوژ
بیچنە لەخاك وەك داری بەردار

* * *

رەش سپی بوون زەحمەتە نەك سپی ڕەش بوونەوە
هەر هەبوو نەبوو ئینسان وەکو گوڵ گەش بوونەوە
لەراستی دا خۆ ئاگر بەئاوی دەکوژێتەوە
بەلاّم مێژوو بێ خۆڵە بەخۆڵ ڕەش دەبێتەوە

* * *

زمان تەڕی دڵ ووشك
ناپەسەندی وەك مشك
چزی لەسەر پشتێتی
پێوەدا وەك دووپشك

* * *

هەوری بێ باران، داری بێ سێبەر
ئاوی بۆگەنی یاژنی بێ بەر
ژینی بێ مەبدەء گەوهەری نەزۆك
ئاوی بێ زەوی یان تاجی بێ بەر

* * *

هەرچەندی گەڕام لەناو زەمانە
هەرچی خۆم دیتم بەو دوو چاوانە
هەر ڕاکێش ڕاکێش هەر کەس‌و بۆ خۆی
بەخوا باوکەکەم هەر فەقیرگانە

* * *

دڵم بریندار مێشکم لەتلەتە
بەندی هەژاری‌و زنجیرو پەتە
کام تەبیب هەیە دەرمانی دڵکا
تیماری مێشك، چاری زەحمەتە

* * *

هەندێك ساختەچی، هەندێ عەبووسە
هەندێکی بۆ خۆی زمانی لووسە
هەندێ پوول پەرست، هەندێکی شەهوەت
دەشێلێ ئیرادەو لەچارەنووسە

* * *

هەتا دەبمەوە خۆڵەکەی جاران
لەلاشەم دەردێ گوڵی بەهاران
دێن لەبۆ سەرم لەبۆ گوڵ چنین
هەر دەڵێم مافو مافی هەژاران

* * *

تا کەند نەڕوخێ شێو پڕ نابێتەوە
پوول پەرست نەبێ پوول خڕنابێتەوە
نابن بەلاوو کچی نەوجەوان
کۆرپە بێ مەمك قەت ژێر نابێتەوە

* * *

چم لەخەڵقی دا یاخوا دەبتە لۆرت
من ژینم دەویٚ نەك تەلارو فۆرت
بۆ خۆم دەگریەم بۆ هاوژینی خۆم
بۆ کەسم ناویٚ بەندیخانەو کۆت

* * *

لە هەموو جێگاو ناو هەموو قەومان
دەست گرتن هەیە لەبۆ لیٚ قەومان
لەبۆ شاعیرو ئەدیبو زانا
بەس لەناو کوردان وا بویتە گەمان

* * *

هەر تێنی بم باشترە نەخۆم ئاوی ئەو بیرە
جارێکم خوارد نەخۆش بووم ئێستاش ئەوەم لەبیرە
چ دەردم دیت بە چاوان چوومە باوەشی مردن
بۆیە لەفکرم ناچیٚ پێی ناکەم ئەو هەویرە

* * *

زەرەرێك نەكەی لەبۆ دوو قازانج
هەتاكو بژی ناگەی بەئامانج
ئەگەر وا نەكەی هەڵخەڵەتاوی
قازانجی ناكەی هەتاكو ماوی

* * *

چاو شینی چاو كتكانی
دەستە برای شەیتانی
شەیتان هیچ رێی پێ نابا
ئەو فیتنەی ئەو دەیزانی

* * *

لاشەی نەسوتێ بە ئاگر تەواو
بیرو بڕواكەی نادیترێ بەچاو
بۆنی خونچەكەی بڵاو نابتەوە
پەروەردەی ناكەن بۆ شوشەی گوڵاو

* * *

کەر بەکادانان قەت قەڵەو نابێ
ماینی شێتو شوور بێ جلەو نابێ
بۆنی خوێن دەدا دوو بیرو بڕوا
لە ڕۆژهەڵاتو لە ڕۆژئاوا بێ

* * *

بۆ داڵغەت داوە لە زوڵفو خاڵی
بسم الله نابێ لە سفرەی خاڵی
کەیار تۆی نەوێ یارت بۆ چییە
بچیە خەیاڵی دوو لێوی ئاڵی

* * *

هەتا شاعیری ئەدیبو زانا
بەنیو دینارت نایەتە هانا
دینار پەرست قەت نابنە دۆستی کەس
گیان بەخوا نادا بە سوکو سانا

* * *

من لە پێشوونان ئەوەم زانییە
چی بێتە سەرت لەنەزانییە
ناوچەوان نووسین بۆ قەڵو قومار
بەو قسە نارازیم هیچی وانییە

* * *

نەفس خۆ بەردان هەندە باش نییە
خۆزگ قۆتەلەی ئاوی ئاش نییە
قسەی بابانو باپیرەکانمان
تاقی کرایتەوە خۆ بەلاش نییە

* * *

باریان گەوهەرە ئالیکیان کزن
بێشك بێ هۆشو دوبەشیان دزن
لە شاخەوانی هەندە چالاکن
گورگان خواردی بن هەروەکو بزن

* * *

هەنگوین چەند خۆش و شیرینی هەبێ
بەکەڵکی چی دێ لە پێستی سەبێ
هەرچەند دەرمانی برینی سینگە
سوودی هی هەیە کە بۆ من نەبێ

* * *

تۆ کچی جوانی کوردانی
پەروەردەی ناو شاخانی
ئاودێری گوڵ و ڕەیحانی
خونچە چنی باغانی

* * *

وەکو خەواڵو لە شیرنی خەومان
وەك وشیار دەبێ لەپڕێ بەجێ مان
دامێنی گرتی و سەد هاوار هاوار
دادت بۆ نادا وەختی لێ قەومان

* * *

گەر گران نەبم بۆ خۆم سوك بكەم
كاری چاك نەكەم هەی چروك بكەم
چاكەكم نەچاند تا بیدورمەوە
گەنم نەچێنم بۆ درك تۆ بكەم

* * *

خەراپە خۆش و گەلێ هاسانە
چونكی فەسادی و كاری شەیتانە
ئینسانی بۆگەن بۆ كاری پیسە
چاكە میرات و كاری مەردانە

* * *

چاكە بەسامە زۆر پڕ هونەرە
وەك داری بەر كە پڕ سێبەرە
خراپە كانیشی زۆر مادی و مردی
شەیتان لێی بردی و حیز و ماكەرە

* * *

تێگەیشتن نەبیتن زانا قەدری چی هەیە
بەڵکو پێ ی دەڵێن شێتە فکرێکی قوڕی هەیە
منو باڕوتو ئاسن لەلای قاتل بەقەدرە
ئەما قەدری زێری سور لەلای زێرنگر هەیە

* * *

هەر دەسوڕێ ئەو چەرخە دایم هەروەکو ئاشە
کەی تێک دەچێو تێک ناچێ ئەو قسانە بەلاشە
بڵێ پەلکی دارەکان وەختی دەژێ بۆن بۆ من
ئێستا شکلی گۆڕاوە وا دەکرێتە قوماشە

* * *

هەر شتێ نووسراو دیارە شتێکە
مەڵێ بێ کەلکە هەرچەند کەمێکە
تۆ بیخوێنەوە بیخە ناو مێشک
قازانجی دەدا بەڵکو خەتێ کە

* * *

لە گوندێکی جیرانمان وا هاوارو سەگ وەڕە
کەس نەبینێ یاڕەبی گورگیان لە پێستی مەڕە
دڵم بەکێ دەسوتێ واعیزی گوێ گرانان
پاش و پێش کەسێك هەیە زانا لەناو نەزانان

* * *

ڕەنج بدەو بخۆ وەکو سوڵتانی
بۆچی چاوشۆڕی دەستی عەبدانی
بۆچی بەبێ سام ڕیاکاری کەی
ئاخری بمری بەبێ ئیمانی

* * *

کێ دەلیلم بێ لە لێ قەومانی
هەر ئەو برایە کەریش دەیزانی
بەڵام بۆ خوا بێ بۆ ڕێ ی ئینسانی
هەر ئەو دەیزانی ڕێگەی ئیمانی

* * *

مەن بەبێ بابو تۆ بەبێ داکی
یارێ پەیدا کەین وەك عەمەل چاکی
تا رەفیق بیتن بۆ منو بۆ تۆ
بۆ وەقتت بڕوا بەبێ باکی

* * *

لە پاش حەمدو خواناسین دەبێ ببین بە ئینسان
ئەعمالی چاکەت نەبێ نابتە ئیمان بە قورئان
غافل مەبە ئەی ئینسان هەر کەس لەلێ قەومانە
گەر زەنگینەو گەر فەقیر گەر دەروێشە گەر سوڵتان

* * *

وام ئەزانی یاری جانی
هاتە لات دڵ زۆر بەسانی
شەو قەلاتی بۆ بەراتی
دەست لەسەر سینەو مەمانی

* * *

وەی کە سامی بێ ئارامی
ناڵە ناڵی جەرگی زامی
تازە لەیلی زۆر بێ مەیلی
دڵ بشکێنی زۆر نەفامی

* * *

بەم دووچاوە دڵ سوتاوە
چاوەڕێی دوو قەترە ئاوە
قەترەیی لێو ئاوی دوسێو
بابنۆشێ تاکو ماوە

* * *

حەپسی داوی زوڵفی خاوی
بەندە تا خەو دێتە چاوی
لێت بوە یاخی نەچیە باغی
مەنعی کوردی تاکو ماوی

* * *

زوڵمە قوربان من پەرێشان
پێشکەشت بێت وا دڵو جان
من نەخۆشم غەم دەنۆشم
تۆش لەبۆ من ببیە لوقمان

* * *

دنیام بۆ نییە بۆ دنیا نیمە
بەشی من کانی من لەبۆ چیمە
گەنجی قەناعەت ئەسلا نابڕێ
چیم لەدەستا بێ بۆی ڕازیمە

* * *

ئەگەر ئەم توانی خۆم خەلاس بکەم
چۆن سەبرم دەبوو عەبدی ناس بکەم
تۆی خالقی من خۆ عەبدی تۆمە
ڕێگام پێشاندە خۆم دەرباز بکەم

* * *

هەوار یا خودا پەنام بۆ تۆیە
مولك سەرپاکی خۆ مولکی تۆیە
یا دامەزرێنە یا بمبە لای خۆت
تاج و سوکنەی من کلاوی خۆیە

* * *

بۆلای دراوسێ گەر ڕاستت دەوێ
هەندە نەچتە لای لەبەر دڵ کەوێ
لە چونە لاشی زۆر دانەنیشی
بێزاریان بکەی تا نیوەی شەوێ

* * *

کەر کەوتە ناو قوڕ کێ لەدیار یبێ
کێ دەری دێنێ کێ خەم خوارێتی
بێ لە خاوەنی کێ چاوی لێ یە
کێ باری ژین و کاروبارێتی

* * *

چەقەڵ قەشمەری بەشێران دەکا
نێرەمووک ژن و بە مێران دەکا
منافیق بەخشین دەکا بە مەخسود
گۆیا پیاوەتی یا خێزان دەکا

* * *

شانازی نەکەی ئەی مانگی تابان
بە ڕووناکی خۆت لەسەر ڕووی جیهان
ڕۆژ پێت نەبەخشێ ڕووناکیت کوانێ
ئەویش ڕۆناکە هەر بەخوا پێدان

* * *

ئەگەر ناتەوێ ڕووت و ڕیسوابی
ئەبێ دڵ پاکو کردەوەت چابی
بە دزیو ئاشکرا ڕەنگێکت هەبی
لەدوو فەرموودەو پێڕەوی خوابی

* * *

لێم عاجز مەبە یاڕەبی خوایە
سەت خۆزیا خوارو خێچی نەبووایە
سەرم دەرناچێ لە خوارو خێچی
دەزانم ڕاستی دەبتە سەرمایە

* * *

الدنیا مزرعة الاخیرة
بێ شك لە ئاخر دەبتە باخیرە
لەبۆ خراپەش ببیە فرعەون
نەبیە خاوەنی خەزنەی قاهیرە

* * *

نەپێڵاوی تەنگ نەخانەی بەجەنگ
نەك هەڵگرتن بۆ گندۆرەی بەڕەنگ
عەقڵیش بەجوببەو مەندیل‌وعەبا
نەژن بەجوانی و شل‌و شۆخ‌و شەنگ

* * *

گورگ گورگێنی دەکا بەڵام کاتی تەنگانە
هەمووپشتی تێك دەکا زۆر بەمەردیو ئازانە
خائین نییە وەکو کەو کە بۆ لقیٚ تاڵی شك
یەکتر بیننە ناو قەفەز بۆ سەر شیشەو برژانە

* * *

خونچەی شەوی ڕابردوو هاتە لام مێوانم بوو
خوسرەو لە دەرکەی ئاخی باخچۆڵەی سێوانم بوو
شەربەتی دوو سێوی سور لە جامێکی وەك بەللوور
لەگەڵ خونچەی دەم خۆشی لەدەستو لێوانم بوو

* * *

ئەو چاوە جوانانەت گیانە مەستو خومارە
گەردەنوو خونچەی سینەکەت باغی بەهارە
مەمکوژە بەو دەردە خونچە بۆچی دەمکوژی
بەو چاوە جوانانەو زوڵفو بەو لەنجەو لارە

* * *

قیمەتی کانی وەنەوشەو سومبولی ناو لالەزار
مەحتی گوڵ کردن لەلایەن شاعیرێکی هەرزەکار
تا هەناسەی دەم لەیاران نەچووە ناو باغان بەبا
خونچە بۆ شاعیر لەکێ هات مەی لەزاری بێتە خوار

* * *

بەیادی لەیلاو چاوە بازەکەی
بەلەنجەی بالاو عیشوەو نازەکەی
کەوتمە خەیاڵو وێنەی هاتە لام
هەستامو رۆیم بۆ دەروازەکەی

* * *

لەبەر دەروازەی چاوم هەڵپڕی
دڵم لانەما وەك تەیر فڕی
دانە خوری بوو بەستی بە داوان
بەدوو موژگانیشی جەرگمی بڕی

* * *

بۆچی نەناڵی سامی بریندار
خوێنی نەڕێژی لەجەرگی زامدار
بەڵکو بێتە لای لاشەی بێ دڵم
بە باڵای شلو بەچاوی خومار

* * *

لەناو دڵداری باڵادا دڵێکم بوو ئەویشم چوو
لەناو باغی بەهاران دا گوڵێکم بوو ئەویشم چوو
لەناو عاشقان بەبێ یارم خەیاڵمە ئەمن ئیمڕۆ
لەناو یاری زولف تاتا شلێکم بوو ئەویشم چوو

* * *

وا خەم دای گرتم هەروەك ژێ ی کەوان
پشتی چەماندم بە ناڵەی شەوان
بێ زاری کردم لە ژینی دنیا
لە سامی دەوێ وا ڕوحی ڕەوان

* * *

بەمانەوەی حوم نەماوە بڕوا
هەژاریش یەخەم بەرنادا بڕوا
چەند هاوار دەکەم دەڵێم دەفن بە
سامم لێ ناکا بەمن چۆن دەڕوا

* * *

داخوا زارت شین بوو لەو نانە بەو دۆشاوە
یان تامەزرۆی خەیاڵت لەبۆ گۆشت و پلاوە
رێوی چۆن دەبێ بڵێ هەر خۆمم شێری بێشەی
مریشك هێلکەی قازی کرد قون دڕانی بۆماوە

* * *

ئەی هەژارو بێ نانە لەناو ژینێکی تاڵە
خواردنەوەو خواردن جلی هیچ نییە هەر خەیاڵە
خالۆ سامی چی بکا خەیالیشی پێ نادەن
لەناو خەڵقی بێ ڕووەو دوژمنیشی لەپاڵە

* * *

هەرچی خەڵقی بشکێنی غایەی خۆ هەڵکێشانە
سوکی چۆن گران دەبێ شێلمیش هەر بەکێشانە
تۆ خەڵقی بۆ دەشکێنی ئەگەر بەخۆت نەشکاوی
لۆمەی ئەو کەسەی دەکەی کەوا لەروح کێشانە

* * *

هی لۆمەی خەڵقی دەکا وازی لەخۆ هێناوە
زۆر هیچ و بێ نمودە لەناو خەڵقی شکاوە
ناوێکی لەخۆی دەنێ و خۆ پێشان دانی خەڵقی
چونکی بۆ خۆی هیچ نییەو لەناو خەڵق بێ ناوە

* * *

سامی هێشتا چت دیوە خەراب تر لە پاشترە
لۆمەی خۆت بکەی گەلەك لەمەی خەڵق چاترە
مەڵی عەقڵی من وردە پرسیار لەناحەزت کە
هەتا پێشانت بدا عەقڵت لەوان شاشترە

* * *

گا گاجوتەکانم ئەوا پیر بووینە
نان خۆرەکانم هەموو زوێر بووینە
چونکی ئەوانی لەنانیان دەوێم
هەموو تۆراون لێم دڵگیر بووینە

* * *

خەڵقیان لەلا وەك کەرو گایە
خوێیان لا وەستاو بەرزو باڵایە
وەکو کەرێ هەردوو گوێ بڕاوە
لە زانین دا تا بڵێ ی زانایە

* * *

نەکەویە دەستی ئەولادی ناپاك
هەر ڕقەی دەکەن لەگەڵ بابو داك
هەردەم یاخینە لە خوا و پێغەمبەر
هەموو ئینسانی باش و عەمەل چاك

* * *

بێ شك دوژمنن ئەوی بزانێ
پێڕەوی خودا بەهیچ نازانێ
مادام رقەی کرد سامی لێ نەبوو
سوارە لە پشتی کەری شەیتانێ

* * *

بسم الله نابێ لە سەفرەی بەتاڵ
شوتی بچێنن لەبەر ئاوی تاڵ
هەینێ دەزانن شیرین لە تاڵی
وەك هەنگوین هەیە لەزاری هەلاڵ

* * *

سەرم سوورمایە لەبەر هێزی تۆ
لەروح گەورەیی قێزو بێزی تۆ
چ حیکمەت هەیە چۆنی بزانم
ناشبێ بێمە ناو بیرو رێزی تۆ

* * *

لەبۆ بێ پێڕەوی سامی نابێ
مردی ئەگەر مرد وەڵامی نابێ
شیو گشتی خوێ بێ بەکەس ناخورێ
گەر خێشی نەبێ هیچ تامی نابێ

* * *

حوڕیەت بۆ نەزانان ڕێ دانە بۆ فەسادی
بۆچوونە ژوور لەدەرکەی هەتیوبازی و کەسادی
بەڵام لەبۆ زانایان هەر خاوەن و پێڕەوبن
خێرێکی زۆر گەورەیە دەبنەوە خۆشی و شادی

* * *

هەر پارەیە دڵبەرە هەر دینارە دین بەرە
بەو دەڵاڵەشیان دەگۆ ئازاو میللەت پەروەرە
کەچی ئیمڕۆ دەرکەوت عەدوی موڵک و میللەتە
خائینی دین و دنیا دوژمنی پێغەمبەرە

* * *

لە کوردستان سێ کەس شازن
عەیشە گوڵو ڕەعناو گوڵنازن
بەڵام واخۆ جێ ی پەرۆشە
بەجوانی خۆیان دەنازن

* * *

دنیا با بڕمێ ئەمن بێ باکم
بێ پولو پارەو بێ ئاوو خاکم
ئەمن کە نەمبێ کەلاوە کونێک
خەم لەچی بخۆم بۆچی خەمناکم

* * *

بەزمانی بێ دڵ ئەڵڵام بۆ دەکا
واجب لادەدا قەڵڵام بۆ دەکا
لەناو مەیخانە مەستو خەیاڵی
تەسبیحاتو سەلامم بۆ دەکا

* * *

چیتە زەمانە چیت لەمن دەوێ
هی بەمنت داوە هەر نالەی شەوێ
هێشتا نەقایل دەورەم لێ دەدەی
هایوهۆی دەکەی گیانت لێم دەوێ

* * *

ئەی چەرخە کەچە بەسە هەتا کەینێ لەمن دان
دەمخەیتە نالین و خەم زنجیرو بەندو زیندان
ئەو رۆژی منت خستە خەزای کۆتو تەبیعەت
ناتانی کە ڕامگری بۆ کات و وەعدەت پێدان

* * *

رۆژێکی دەبێ دین دەبێ بەناو
قورئانیش وێنەو شکلێکی تەواو
هەتا کاتێکی وەك زوڵم دەڕمێ
دەبتە کەلاوەی دێڵە سەگی زاو

* * *

فەللاح گەنمی دەچێنێ بەڵام خۆ سەرمایەدار
زێڕو زیوی تۆ دەکا بویتە سەپانی دینار
زەوی گەنمی فەللاح و زێڕو زیوی زەنگینی
فەللاح لەبۆ ژیان و زەنگین بۆ کۆشک و تەلار

* * *

لە ناڵەی شەو کە گوێم ڕاگرت لە باغیدا دەڵێ بولبول
لەبۆ خونچەی دەناڵێنێ ئەوا پشکوت گوڵی من بوو
لەسەر تەختی زوڵف پۆشان پەری زادێک بە گوڵ بەخشین
گوتی کا( سامی) بیهێنن کە تێفکریم شلی من بوو

* * *

وادەکەی ڕۆژ ئاوایە وادەکەی ڕۆژ دەبتەوە
ئەو زگەی وەك هەمبانە پڕ دەکەی بۆش دەبتەوە
هەموو ساڵێکی لەنوێ لەداری ڕەق ترش و تاڵ
دێتە کایە بۆ خواردن کاتی دێ و خۆش دەبتەوە

* * *

ئەی قەشەنگەی شۆخ و شەنگەی قەد شلەی چاو مامزە
برۆ غەدەنگەی وا لە جەنگەی ڕو گوڵەی بڕوا دزە
بۆچی ناپرسی لە حاڵم ناڵەوو شەو زارمە
جارەکی نەیگۆ لەکێ یە بۆچی زەردو وا کزە

* * *

هەر وەکو دەبێ هەبوون و نەبوون
هەبوون میراتە لەبۆ پول بەقون
بەڵام لە دینی بێ بەشن بێ شک
نە ئیسلامیشن نە دیان و نە جوون

* * *

عەقل لەکێ بێ ئیقبالیش لەوێ
دەبەستریتەوە بە ڕۆژو شەوێ
ئەمن بڵێم چی تاوانم چی یە
بۆ یەخەم دەگری چیت لەمن دەوێ

* * *

ئەو گێ حیزەی نامەردە
دڵی وەك دارو بەردە
دوژمنی خواو ڕەسوڵان
هەژارو پیاوی مەردە

* * *

کەرامەتی بێ کەشف ناینی نانێکی سووتاو
کەشفی بەبێ کەڕامەت بە قوربانی دوو قوم ئاو
کەشف و کەرامەت هەیە بەڵام پێم بڵێ کانی
نەمان ستاندەوە لەدەست ناکەسی پیس و گڵاو

* * *

کەرێك چاترە لە شێرێکی نەڕ
سەت فیل دەهێنێ یەك سەر بزن و مەڕ
خوری شێران و توکی پڵینگان
نابێ بە حەسیر نەدەشبێ بە بەڕ

* * *

خواردن‌و خواردنەوەو نانی هەژاران
بەندە لە قاسەی سەرمایەداران
هەرچەندی دەڕواو نامێنێ ئەوەش
ژنیش حوڕ دەبێ هەروەکو جاران

* * *

سەرو سەرمایەی ئەنگلۆ ئەمریکان
قومبلەو دۆلار لە دەریاو جیهان
بەقسەی گەورۆنە بۆش‌و هیچ‌و پوچ
من سەیرم پێ دێ چۆن دەرمێ بەسان

* * *

گورگ گورگی تێ دەکا بەلاّم ڕۆژی تەنگانان
هەمووی قونی تێک دەکا وەکو مەردی مەیدانان
بۆ مافی گورگێنی خۆی ناترسێ لە شێری نەڕ
لە باڕوتو لە ئاگر گوللەی گەرمی بێگانان

* * *

ئەشعار تۆ دەكا بۆ گوڵ بەردەدا
وەردو شۆ دەكاو ژینی بەردەدا
مەردو بەنرخ و خاوەن پێڕەوە
نەك مافی ئینسان مافی كەردەدا

* * *

كارت ناشیرن و وەها بزێوی
بۆیێ نەخۆش و هیچ و دزێوی
مەراقت هەركات خاڵی حەبەشە
بۆچی بەختەكەت ڕۆیشت و ڕەشە

* * *

رون و ئاویێ بكوڵینە لە مەنجەڵ و جێگایەك
تێكەڵیش بێ دڕۆیە هەر بەخۆ وەك هەوایەك
لێكتری جودا دەبنەوە بە چاوی خۆت دەیبینی
لەكاتی ساردبوونەوە هەر یەكەی دەچێتە لایەك

* * *

هەندێ بەناوی زانین کەردەبن
کەچی لە گوریسی ڕاستی بەردەبن
بۆیە لەپاشان دەبن بە بەش خۆر
بۆ کورسی و دینار تێکیش بەردەبن

* * *

داری حیزی بەریدا میوەی دەخۆن شەلاتی
چونکی خوێن سەری لێدا دێتن لەساڵی هاتی
ئەو هاشە هاشی کەدێ بێ هێزی پێشان دەدا
لە مەترسی بترسە لەو بێ دەنگو لەماتی

* * *

من رازی بم تۆ رازی
چی دەکا مامەقازی
گەل یەك بیرو بڕوابێ
چۆن دەژی حیزبی نازی

* * *

وەکو باست بۆ دەکەم گیرۆدەی ئەو ژیانەم
لەژێر نینۆکی مردن لەناو چەرخی زەمانەم
لەق لەق لەسەر مناران جێ بۆخۆی دەدۆزتەوە
ئیلا من نەبێ ئەوا بێ جێگاو بێ هێلانەم

* * *

لەلای خۆی موجتەهیدە تکا لەو خوێنەی دەکا
بەناوی من پینەچیم مام وەستا پینەی دەکا
فەرقی منو ئەو چییە هەردوکمان هەر پینەچین
من پێڵاوان چادەکەم ئەویش ئەو هینەی دەکا

* * *

ئەوی لەڕێ لادەدا غایەی هەر ڕاوو ڕووتە
نیوەی دڵی سووتاوە وەکو سەڵکی بزۆتە
من مافیشی هەر دەگرم هەژارێکی برسی بێ
کە حاڵی زۆر ناخۆشو بێ دانوو ڕووتو قووتە

* * *

یـــاوەکو دەروێـــش لـــەبۆ خـــۆم هـــەر لـــە گونـــدو شـــارەکان
محنـــەت و دەردی هـــەناوم هـــەر لەگـــەڵ بـــێ چـــارەکان
بـــاس بکـــەم بـــا دەردوژانـــی و زیللـــەتی خـــوێن خوارەکـــان

کـــێ دەتـــانی دەردی عیـــشقی چـــارەکاتن یارەکـــان
وەختـــێ خورشـــید پەرچـــەمی تـــای پـــاکی هەڵدەســـتێتەوە

کـــەس نـــەڵێ عاشـــق دەترســـێ کـــاتی دێتـــە ســـەر صـــەلیب
عالـــەمێك پـــاکی دەزانـــێ هـــەر کـــە یـــارێکی نـــەجیب
حـــوکمی خنکـــانیش بـــداتن خۆیـــەتی دەردو تـــەبیب

یـــادی کـــرد دەردی هـــەناوم ون بـــبێ و کـــاری رەقیـــب
ئـــەوجا بـــەقاقاو ڕووبـــەڕوی یـــار هـــەینێ دڵ دەکرێتـــەوە

بـــەرگی خـــوێنینی لـــەلای یـــار وا لـــەبۆ مـــن هاتییـــە
روح بەکێـــشان رازی نـــابێ یـــار نـــەبینێ عاســـییە
کـــەی دەمێـــك لـــوتفی هـــەبوو یـــار ئـــەو دەمـــەی چـــی زانییـــە

بمـــرە (ســـامی) هـــەر بەخەنـــدە مردنیـــشت شـــادییە
بگـــری دووڕو بـــۆ نـــەمیمتان مـــاڵی بـــا کۆربێتـــەوە

* * *

بۆ تۆ شینو گرینو ناڵەو ناڵو وەی دەکەم
کاری مەجنونی گرینە من لەشادی چی دەکەم
جاریٚ ناپرسی لەمن تۆ چی لەمن کرد بەختەکەم

خۆ ئەگەر بیٚ حاڵو بیٚ حالیم نەپرسی لەیلەکەم
شیٚتو شەیدامە لەتاوان دەشتو سەحرا پەی دەکەم

جاریٚ دەگریمو دەناڵم جاریٚ خەندەو پیٚکەنین
جاریٚ بیٚ هۆشو خەیاڵی دیٚ لەبۆ باغی دەچین
فکری مەم وا دیٚتە پیٚشی بۆ تەماشای خاتو زین

گا لەسەرکیٚوان دەسوڕیٚم گا لە فیکری گوڵ چنین
گاهیٚ دەرویٚشم لەتاوان چاروبیٚ چار حەیدەکەم

لەتاوی دەردی یارە عاجزو زویٚری منم
کوشتەی تیغی مژانو ئابرۆیی شمشیٚری منم
بیٚ کەس و تەنها لەزیندان حەپسی زنجیری منم

گاهیٚ دەبمە باغەوانو یاری هاوبیری منم
گاهیٚ سوڵتانو غەنیمە گاهیٚ ئیسکاف دەکەم

گــەر هاتــە یــادو خــەیاڵم بێتــە پــێش چــاو شــۆخەکەم
بــێ بەشــە بــۆ کــەیف و شــادی ڕوو لــە شــینە بەختەکــەم
مــن لــەئاگری عیــشقی یــارە دیــارە تــاجو تەختەکــەم

گاهلــە بــاغی دادەنیــشین مــەی دەنۆشــین دەم بــەدەم
گــاهێ تەنهامــە لەبەرِیــە ڕو لــە دەشــتی ڕەی دەکــەم

پــێم مــەڵێن بۆچــی دەنــاڵی چــاری مــن بــێ چــارییە
خەنجــەری موژگــانی لــەیلا وا لەجــەرگم کارییــە
بــۆیێ ئەشــکی چــاوەکانم ڕەنگــی وەك مرواریــە

وا لــەتاوانی لــەکێوان کاروپیــشەم زارییــە
دەم خــەریکم هــەر بــە قاقــا مــەیلی تــاجی کــەی دەکــەم

لای عاشــقان وا دەبیــنین لاڤ مەعــشوق لێــدەدەی
وەعــدەداری عاشــقی تــۆ بۆچــی وەعــدەی پــێ دەدەی
ڕۆژی خــۆی شــەرتت بــەمن دا بــاغی ســینەم پــێ دەدەی

بۆچــی ئێــستا وا بەناحــەق حــوکمی حەپــسیم پــێ دەدەی
دیــل و یەخــسیرم لــە بۆیــێ مــەیلی دڵــزاری دەکــەم

پێم دەڵێ ئەو شۆخە کوردەی شیرینەی روماهی ڕوم
تۆ مەناڵێنە و مەگریێ مژدە بێ من شۆخی تۆم
جارێ ناتانم بەنوسین بۆ تۆ دەنگو باسی خۆم

پێم دەڵێ خۆ تۆ دەبینم هەر کە دێوانەی لەبۆم
وا مەزانە پەردەیە بۆ دیتنی تۆ پێچکەم

دەبتە خۆشی ئەو گرینو ناڵە ناڵو زارییە
وەختی مردن بۆ رەقیبی سەگ سیفەت وا هاتییە
قافلەیی بەختت دەبزوێ بەسیە ئەو غەمبارییە

رۆژێ دێتن وا لەپێشە هەر کە رۆژی شادییە
وەك زولیخا بۆ عەزیزی مەنعی دو خونچەی دەکەم

کەوتمە داوی دەردی عیشقی خۆمو بەختو ناوچەوان
ئاگری دڵ وا دەسووتێ نەك ئەمانێ سەد ئەمان
من لەبەینی مردنو ژیندا یا دەمینێم یا نەمان

وا لەبەحری سوری خونین سامی گرتوە کەشتیەوان
فرتەنەی بەحری لەپێشەو بۆنی غەرقی مەی دەکەم

* * *

زوڵفی دەهەژێ چینە وەکو جەیشی هۆلاکۆ
بلغارو فەرەنگو حەبەشو رۆمییە یاخۆ
پەرچەمە بۆ کوشتنی من وا هاتووە ئیمڕۆ

موژگانی وەکو تیرە لەناو قەوسی دو ئەبرۆ
لێ ی مەدە لەو خاکی غەریبی بێتەوە سەرخۆ

زاڵم و خوێنڕێژو غەرورو بێ دینو باغر
بێ رەحمی وەکی خۆی نییە ئەو زاڵمی کافر
پێم گۆ دەبەسە بمکوژە ئەی دولبەری ساحر

لایێ بەزنجیرو کەمەندو لایێ بەئاگر
زانیتە کە فەوتاوە دڵم بۆ چییە رۆڕۆ

زوڵفت دەهەژێ چینو بەخۆت بویی بەسالار
لە هجومی وەحشیەتی وا وەك لەشکری تاتار
فەقیری وەکو من چییە هەی زاڵمی خوێن خوار

دەمدەیە بەر تیری غەزەب تۆ لەسەرو خوار
دەربەدەری چۆڵو چیام وەك کۆچەری هەڵشۆ

دڵمی برد بە ئەسیریو گرتێتێ بەپەنجان
لە کەمەندو حەپسی زنەخ بەستێتی بەزوڵفان
پیێم دەڵێ تا ماوی دەبناڵێنە لەداوان

پشکوتنی گوڵ تێپەڕی لەو بولبولی خۆشخوان
ئاخی لەدڵو گریەوو ناڵینی سەحەر بۆ

دیوانە لە سەحرایە کە شەیدایی دوکوڵمە
هەروەکو بولبول رۆژو شەوێ خونچە لەدڵمە
هەرکەس لە هەوەس بۆ منە غەمخواردن و جلمە

ئەو رۆژی کە بەرگی شەهیدیت هاوێتە ملمە
چەند کردمو نەمتانی کەوا نەیکەمە بەرخۆ

لەو رۆژە بەدڵ عاشقو سەوداگەری تۆ بووم
بێ بەختو نەزان توشی خەلەت گریەو و رۆ بووم
عاشقی لەیلێ ی نەزانو ئەعرابی بەدوو بووم

لای خۆمی نەفام وابوو کەدائیم لەمەکۆ بووم
هەربۆیێ چەمی و گەردەنی وا هاتیتە ئەژنۆ

لەتولی عەمر بەدرێژایی داخی هەناوم
لەخەمی سینەو پەرچەمو ئەگریجەیی خاوم
دەرمانی نییە چارەیی دودەستی شکاوم

هەر تۆ بکە دەرمانی ئەمن یاری تەواوم
دەستانی شکام پێی بڵێ تا بیخەمە ئەستۆ

بێ چارییە ناڵینی لەتاو حاڵی نەمایە
دەمکوژێ ئەو یارە کە پۆشی بەرگی خەزایە
نەم زانییە کوشتن لە چ دینێکی ڕەوایە

لەنیزامی دو ئەژدەرو یابەخی زوڵمایە
سامی چ مەکە شەرتە لەسەر من کە نەڵێم ئۆ

* * *

مەعلومە عەبەسیانە تەکبەر بەتەمابە
ئاگری دڵ بێتە سەرت بۆ گفتو جەوابە
جارێکی نەبوو دەست کەیە ئالآیی سەوابە

بۆ دڵ دزی بێ ڕەحمە کەبێ شەرمو حیجابە
جەللادی منی بێ کەسی واخانە خەرابە

ئاشـــوفته دڵــــی تۆیـــه ئــــەتۆش جـــارێ نەزەرکــــەی
حــــەیرانی خـــەتی تۆیـــه بەفــــەیرۆزو بەکـــــەی کــــەی
تـــاجی موحیببـــەت بـــۆ مـــنی بـــێ چـــارە لەســــەر کــــەی

پەرچــــەم وەکـــو جـــەللادی لەســـــەر ســــەحفەیی کوڵمــــەی
دڵ زامـــــی ئـــــەوە بۆچــــی دەڵـــێن مەســــتی شــــەرابە

دەمــــژدە بـــه بولبـــول دەن ســـــەحەر هــــات شـــەبەقی دا
فەصــــڵی بـــــەهارە خونـــــچە لــــە باغـــــانی دەمـــــی دا
دڵ کەوتیتـــــه ژێــــــر دەرگــــــەوو خــــــاکی قــــــەدەمی دا

زوڵفــــــانی وەکــــــو ئـــــەژدەری جــــــەنگی لەقەدیـــــــدا
ئـــــەی دڵــــه بــــەس لەئـــــەمانی بــــێ شــــەرتو بەقابــــه

وا بەســــــیەتی ناڵــــــەیی کوشــــــتنی بەجــــــەفا بـــــــەس
فـــــەخری مەکـــــه زیبـــا لەســــەر ئـــەو ئــــەرزە هەوابــــەس
مەمخــــــەرە نـــــاڵینی و کەســــــادی و لۆمــــــەیی ناکــــــەس

موژگـــــانی وەکــــو تــــیری لەجــــەرگی مــــنی بــــێ کــــەس
گیرکــــــــردووە، واتیـــــــژە دەڵێـــــــی چــــــەنگی قولابـــــــه

بێ بەهرەی هەوەسە ئەوکەسی بەرگی سیاپۆش
دڵی دوورە لەشادی و هەردەم عاجزو خامۆش
سەروەتی دارا دڵی عاشق ناکا فەرامۆش

سامی کە کوژراوی مژەیی تۆیە بەلا تۆش
زیللەتی بەدکاری وا بەدی بەسیە وەلا بە

* * *

مودەتێکە وا لەهیجرو ناڵەو و هاوارتە
ڕۆژو شەو هەر وا لە شیوەن داخ و میحنەت بارتە
فائیدەی کا چی بەچی کرد مائیلی ئەغیارتە

دڵ لەدەرگا پاسەوان و مەحرەم و خەمخوارتە
وا لە جەورو پڕ فیغان و عەزیەت و ئازارتە

مەحتی باڵایی بەشیرن دێتە بەرچاو بێ مەبەس
دەردی خۆم نابێ بڵێم خۆ قەت نەگوتراوە بەکەس
نابێ غافل بم لەیارم تاکو مابێ یەک نەفەس

قاعیدەی جەنگی عەدوتە روح لەمەیدانی عەبەس
بێ ترس ئەو پیشەوایە شاهی ئەوسالارتە

وای لەبۆ شادی حەیاتت دەم لەسەردەم کەفلە کەف
ماری زوڵفت دێتە باڵا لەم تەرەف بۆ ئەم تەرەف
هاتوچۆی باڵایی شیرن پێچ بەپێچ و قەفبەقەف

جەیشی داو داوت پەریشان دێتە تەدریب سەفبەسەف
غالبی جەنگی هۆلاکۆ زوڵفەکەی تاتارتە

بۆ باغی سینە تەیری بولبول بەنەغمە دێتە دوت
قیمەتی کانی لەلای تۆ عاشقێکی ڕووت و قووت
بێ حسابە پەرچەمی تای داو بە داو و موبەموت

شیری ئەبرۆ تیری موژگان سێ منم تیغی عەدوت
چارەمین بۆ گەنجی حوسنت کەزیەکەی ڕەشمارتە

جار بە لوتفی شیرنی خۆت یا بە پەنجانت بگۆ
دانیشە یەك دەم لەلامان یا لەدەرگا نەم بڕۆ
لە لێوی ئاڵت کەم نییە یا لە داوی مسك و بۆ

مەخسەدی حەربی سوپاهت چی بو چم زانی لە تۆ
جوملەیێکم لێ نەزانی کام هەدەف ئەشعارتە

میهتەری قەلعەی حەوادان پێشەوایی هەر منم
یاری تەنگ‌و تەپلی جەنگ بۆ جودایی هەر منم
ئالی خوێن‌و باری شین جێی عصایی هەر منم

چاو پڕی خەو عاجزی شەو بۆ تەبایی هەر منم
رۆژ لەهاتن شەو لە چون‌و زیللەت‌و یەلغارتە

جار بە ئەبرۆ پێم دەڵێ ی بێ بەخۆشی رێم دەدەی
دابینی خانەی موحیبەت ئیشارەی چیم دەدەی
جار کەڤ صابونی لوتفت لەدەست‌و پێم دەدەی

رۆژی ئەووەل حاڵی خۆم زانی بەکوشتن لێم دەدەی
هێشتا رازیمە ئەمن خۆ چەندی کوشتن کارتە

ئەی ئەسف نازانی رێگا تا خەریکی نەصریبی
سەد سەلات‌و دەست‌و دامەن تاجداری یەسریبی
بێ شکە چارەی شیفابی شیری وەخت‌و عەسریبی

تا بەکەی( سام) دەکەی تۆ ناچییە غاری مەغریبی
فێری عیلمی جەڕ ببی یا چارە هەر ئەو چارتە

* * *

وەی کە عاسیمۆ گوناهکار جاهیل‌و حەیوان منم
بێ بەشی عیلم‌و حەقائیق دووری ڕێی قورئان منم
موستەحقی وەسیەتی ئەو ئایەتی لوقمان منم

ئەی خودا یەخسیری نەفس‌و بەستەیی شەیتان منم
کوڵکێشم بۆ گوناهان عەهدو بێ پەیمان منم

نەفسی بێ دین‌و نەزانم دایما بارە لەقین
ڕێ ی نەدامەت تاگرێ خۆ جارێ ڕووناکا لە دین
گەر ئەتۆ ڕەحمی نەکەی پێی یا ئیلاهولعالەمین

بەندەیی ژێر ئەمری نەفسی پڕ لەئیم‌و ئەولەعین
تەپڵی سەحاری‌و نەفامی واعیزی قاقان منم

مالیکی موڵک‌و حەقیقەت مردن‌و ژیان هەر ئەتۆی
گەر خەلاسم کەی لە چەنگی نەفسو شەیتان هەر ئەتۆی
پادشاهی خێوی جەننەت‌و حورو غیلمان هەر ئەتۆی

صاحبی تەختی بەرین‌و شاهو سوڵتان هەر ئەتۆی
حەولودەر بۆنان‌و خوان‌و ڕوڕەشی جاران منم

پـێ ی لــه ئەسـراری حەقیقــەت گــەر بنێـی یــەکێك بــەخۆی
خـــۆی بــە مـــوجریم دابنــێتن چــەند گونهکـــاره بــەخۆی
بــەرگی جــەهل‌و پیـسی شــەیتان خـۆی بـشواتن هــەر بـەخۆی

یــا کەسـێك بــێ ئــیعتراف کــا بــەو گوناهانــەی لــەخۆی
ئــەمما عاســـی وشـــەرمەزارو لومـــەیی کـــاران مـــنم

واســـیعە رەحمـــی خوداوەنـــد راجمـــە بـــۆ ئیـــنس و جـــان
ئــەو دەبەخــشێ جێـی‌و مــەکان‌و خۆشـی بــێ جــێ بــێ مــەکان
گـــەر جـــەحیم‌و ئـــاوی زەقـــوم بـــادە بەخـــشی جەنـــەتان

ســـامییە مـــژدەی بەشـــارت لـــەو خودایـــەی میهرەبـــان
هـــەر لـــە رەحـــم‌و مەرحەمـــەت دا چـــەندی نائینـــسان مـــنم

* * *

لاشـــەکەی مـــن گـــەر لـــەرێی تـــۆ لەتلـــەت و ســـەت پارەکـــەن
گـــەردنم لێـــدەن بەشـــستێر یـــا پـــەتی ســـێدارەکەن
ئـــاگریش بـــەردەن لەلاشـــەم چـــۆن دەتـــانن چـــارەکەن

مـــن لـــەتۆ زوێـــرو وەڕســـکەن دوژمنـــانی نابـــەکار
بـــۆ دزیـــنی ئـــاوی شـــاخ‌و گەوهـــەری نـــاو بـــەردو دار

گەوهـــــەری نـــاو بـــەردو دارت حەســـــرەتی بێگانەیــــە
بەڵکــــە ســــەت ســـاڵە لــــەداخی ئــــاوی ئەوشـــاخانەیە
چـــونکە برســـی نـــەوتی خـــامو ســـەروەتو ســـامانەیە

وا ســــەتا ســـاڵە لــــەخاکی کـــوردی خـــڕ کردیتـــەوە
هـــەردەڵێ ی کتکـــە کـــە ئێـــستاش چـــاوی چـــڕکردیتەوە

لەوخاکـــە پاکـــە گەوهـــەرین‌و پـــڕ درەخـــتی میوەکـــان
خۆشەویـــستی دیـــن‌و دنیـــای گیـــانی گـــشتی چـینەکان
هـــەر کـــە فردەوســـی جیهانـــە خـــاکی کـــوردو نیـــشتمان

ئـاوی ژیـــنی بـــۆ خـــەڵاتی وا لـــە هـــەڵگوش دێتـــە خـــوار
حۆریـــەکانی خـــاکی شـــادی جـــوانی نـــاگوترێ بـــەزار

خـــاکی کـــوردی پـــڕ لـــە زێـــڕو ئـــاوەدانی پـــڕ لـــەدان
وادەچـــێ بـــۆ دوژمـــنی کـــورد خـــوێن مـــژانی هەنـــدەران
غیرەتـــە ئـــەی لاوی کـــوردان بـــۆ گـــەنی بـــوون بیرەکـــان

هەســـتە بـــۆ یـــەك بـــوونی خاکـــت ســـەربەخۆیی میللـــەتت
هـــەر خـــەباتی خـــوێن ڕژانـــە بێتـــە قـــەدرو قیمـــەتت

هەســـتە ئـــەی کـــورد خـــوێن برێـــژە ڕۆژ لـــەخۆت ئاوامەکـــە
نـــادرێ مـــاف خـــوێن نەڕێـــژی خـــوێن نـــەدەی داوا مەکـــە
وەخـــــتی ئازادیـــــت نـــــەدۆڕێ کـــــاری خـــــۆت ســـــاوامەکە

هەرچـــی ئیمـــڕۆی دا بـــە دوێـــنێ، ڕووت و برســـی مایتـــەوە
ڕووی ڕەشـــــە وەك پـــــشتی قـــــازو غیرەتـــــی تاوایتـــــەوە

کەنـــــدو شـــــاخی خـــــاو گیابەنـــــد دامـــــەنی ئاووهـــــەوای
فێنـــــك و تـــــەڕناو قەدیـــــشی بـــــاغی نـــــەمرودو ســـــەبای
دێمـــە کـــاری جەننەتولخولـــد؟ بـــو (جـــەوانی) ڕۆژی خـــوای

خـــاکی کـــوردە، خـــوانی یـــەزدان پـــڕ لـــەژین و ژینـــەوەی
مـــاق مێـــژووی ســـەربەخۆیی حـــوڕو سەربەســـتی نـــەوەی

میـــــدیاوو کـــــەی ســـــەلام و شـــــێخ ســـــەعیدو مـــــستەفای
بـــــابڕوخێ دوژمنـــــــانی ناحـــــــەزانی بـــــــێ وەفـــــــای
کەوتنـــە لـــەرزە و (ســـامی) هێـــزی تونـــدو تێـــژو پـــڕ جـــەفای

کـــوردی مـــەردی ســـەر بڵنـــدو لاوی ژیـــری مێـــژووزان
بـــا لـــە گـــوپی دا ڕەقیـــب و دوژمنـــانی هـــیچ نـــەزان

* * *

سەربڵندكە ئەی لاوی كورد چاو هەڵێنە بیركەوە
میللەتی دیلو هەژاری ڕو لەگریان ژیركەوە
پێ ی لەكۆتی بەندیخانەو هێشی ناو زنجیركەوە

كوردە ئیمڕۆ ڕۆژی شادیت موژدەبێ ڕۆژی نەوە
هەستە ئالاّی شێر نیشانی زەردو سورت هەڵكەوە

تف لەسێدارەو لەكوشتن بێ لەهێزی قەومی خۆت
كێ هەبووبێتن دەرتكا گەر نەبێتن لاوی خۆت
كێ بەهاوارت دەهات وەك باڕوتو ئاگر دەسۆت

ئەو زوحاكی كاوە كوشتی تێپەڕی ئێستا بەخۆت
كۆتو زنجیری لەبیرو هۆشو دەستو پێ كەوە

تەلعەیی خورشید لەخاوەر شاهی كورد لێ ی كردبوو
فرسو توركی نابوود بن پێ ی وەك ژنان مێی كردبوو
مەردو چالاكی لە خەزنەی بێ ژمارتێ ی كردبوو

ئەوچرایەی كەی قوبادی زابولیت پێ ی كردبوو
جەیشی یۆنانی كوژاندی هەستە زوو بەپێ ی كەوە

ڕۆژو شـــەو مـــن هـــەر لەناڵـــەو هێـــشی ئـــەو دەردو خەمـــەم
هـــەر کەمـــەش مونـــەی شـــەبەیخون پیـــادەگی ئـــەو شـــاجەمەم
هێزەکـــی زۆر پـــڕ لـــەغیرەت چـــەك لەشـــانی ئـــەو دەمـــەم

بـــۆ خـــەبات و ناونیـــشان چـــوونە نـــاو ئـــەمن و ئومـــەم
بـــۆ پلـــەی ژینـــت لەمێـــژوو دەم ببەســـتەو دەســـت کـــەوە

کـــورد بەمـــەردی خـــوێن ڕژێنـــە خواپەرســـتی بـــێ پـــرس
پـــڕ لـــە چـــاکەو غیرەتـــی زۆر بـــۆ خـــەبات مـــەردو قـــورس
شانبەشـــانی کوردەکـــانی ســـوریەو تورکیـــاو فـــورس

بـــەو خوێنـــەی کـــورد ڕژانـــدی و دەیـــڕژێنی بـــێ تـــرس
چـــونکی مـــاف لا بەخۆێنـــە تـــۆپ و لوولـــەی برنـــەوە

هاتـــە جـــۆش غـــیرەت لەلایـــەن پیرەکـــانی بـــێ نـــەوات
کـــەی بـــە ژێـــر دەســـتی ڕەزا بـــو خانـــەیی ڕێ ڕەوات
هەســـتە وەك شـــێران لەگـــەڵ ئـــەو کاکـــە مـــستۆی بـــێ هـــەوات

لانکـــی حـــاجی دەژێ وا قـــانع و کـــەی پێـــشەوات
پێـــت ئـــەڵێن ڕێ ی گـــەل ژیـــانی دەرکـــە هەســـتەوێ کـــەوە

هێــزی ئــازادی خــەباتت دەبتــە کــاری جــێ بــەجێت
دوژمنــت لەتلــەت ئــەکا پــەت بێتــە دامــەن دەســتو پێــت
هــەر بــەکوردی بــانگ ئــەکاتو زۆر بەمــەردی پێــت ئــەڵێت

راپــەڕە ئــەی لاوی زانــا(ســامی) تاکــەی نیــشتەجێت
وا لــە لانــو بــیرو مێــشك گــەردەنو ناوجێتــەوە

*   *   *

# پێنج خشتەکی (سامی) لەسەر شیعری مستەفا بەگی کوردی

تــــۆ ئەگـــــەر دڵـــــسۆزو یـــــارو غـــــەمڕوێن وتــــاهیری
بـــۆ لــــەبۆ کوشـــتن لـــەدوومی خـــوێن ڕژێنـــی زاهـــیری
دەم دەڵێــــی فیرعـــەونی ئـــەمما هـــەر عـــەزیزی قـــاهیری

بـــــۆ فــــریبی عاشـــــقان وجـــــەزبی دڵ وا مــــاهیری
ڕەنگـــە شـــاگردیت بکـــەن میهتـــەرو نەســـیم و ســـامیری

خـــوێن مەڕێـــژە ئـــەی پـــەری ڕوو خـــوێن ڕژانـــدن چـــانییە
ڕەبـــی نەدامـــەت بێنـــە پـــێش چـــاو ژینـــی دنیـــا فانییـــە
بـــۆ ئـــەدەی وەعـــدەی ویـــصاڵت جـــاری ئـــاخر وانییـــە

چـــونکە هاوچەشـــنت لـــە ئیقلیمـــی مەلاحـــەت دا نییـــە
ســـاوەکو خوســـرەو هەمیـــشە لێـــدە کوســـی نـــادری

مـــن بەنـــەرمی دەچـــمە پێـــشی ئـــەو بەتونـــدی پـــێم دەڵـــێ
بـــۆ دەگریـــی بـــێ ئەجـــەل یـــان شـــین و گریـــان چـــی دەڵـــێ
کوشـــتنی تـــۆ فـــەرزە بـــۆمن بـــۆ ڕەقیبـــت پـــێم دەڵـــێ

هـــەروەکو ڕۆح و دڵـــی دووری لـــەپێش چـــاوم دەڵێـــی
لـــەو دڵـــەی پـــڕ دەردو میحنـــەتما بـــەدائم حـــازری

کەســینە خــوێن گــر بــە خــۆتی گــەر لــە ژێــر پامــدابنیٚ ی
یـــاوەکو خوســـرەو لەبەنـــدو ســـجنی شـــاکەیکام بـــنیٚ ی
گــەر لــەناو چــەنگی زەلیلـــی و بـــەحری پرســـەو دامــبنیٚ ی

گـــەر بـــە خەنجـــەر پـــارە پارەمکـــەی لـــە ڕێگـــا دابنێـــی
دەســـــت لـــــەتۆ هـــــەڵناگرم هـــــەرتۆم لەخـــــەڵکی چـــاتری

دڵ لـــــــەتاوان بۆیـــــــێ دەگریـــــــی جاربجـــــاریش ڕوودەکـــــا
بـــۆ بەهەشـــتی بـــاغی ســـینەی ئـــەو غـــرورڕەش ڕادەکـــا
پـــێم دەڵـــیٚ تـــۆ بمـــرە بـــۆ خـــۆت زوڵفـــەکانیش تادەکـــا

کـــافریش ڕەحمـــی بەیەخـــسیرو زەلیلـــی خـــۆی دەکـــا
ســـاوەرە ڕەحمـــیٚ بـــەحاڵم کـــە ئەگـــەر چـــی کـــافری

مـــن گـــوتم تـــۆ خـــوێن مەڕێـــژە ڕوحـــی شـــیرن ئـــەو گـــوتی
خـــوێنی تـــۆ بـــۆ مـــن حەڵاڵـــە ڕۆژی ئـــەووەل پـــێم گـــوتی
ئەوکەســـی واتـــۆی فریبـــدا ئـــاهی مـــن خـــواڕوی کـــوتی

بـــەختی ئـــەو ئوســـتادە ســـووتێ دەرســـی ســـیحری پـــیٚ وتـــی
وا کـــەتۆی بەردایتـــە گـــژ عالـــەم بەمـــەکرو ســـاحیری[1]

---

[1] واکەتۆی بەردایە گشت عالەم بەمەکرو ساحری. (دیوانی کوردی، هەولێر، ص٥٤).

چەندی کاری تۆ توانجە هێشتا من لام خەندەیە
دیتنی خورشیدی روی یار سالێ جارێکم هەیە
سامی ریزوانی غەمانو لۆمەکاری بەندەیە

کوردی لێت بێ سەد ئەمانەت هەر کە ئێمە شەو جومعەیە
تا سبەینێ قەت مەبە غافل لە زیکری قادری

* * *

من قەسەم دەخۆم بەدوو خونچەکەت
بەڕوی ناسکو دەستو پەنجەکەت
بەژانی زولفو لارو لەنجەکەت

دڵ یادی عودو سازو نەی دەکا
بڕستبو جەنگی کەی خوسرەو دەکا

بۆ هەرجێ بڕۆی دڵم لەرێتە
بێ دەنگە هەر وەك خاکی بەرێتە
لەبەر عشقی تۆ پێم دەڵێن شێتە

بۆ خزمەتی خۆت بملاوێنەوە
بۆ کەیفی رەقیب مەمتاوێنەوە

ئاهم بتگرێ بیرت فراندم
دڵ کەوی بوو لێت هەڵفراندم
شوشەی خونچەکەت بۆ لێ شکاندم

ئێستا شوشەکەی دڵم شکاوە
بۆیێ خونچەکەت سیسوو بێ ئاوە

بانگەت ئەکردم بە نوکی پەنجان
مەستت ئەکردم بە زوڵفو لەنجان
ئێستا لەسەرچی بۆ لەمن رەنجان

قاقاکەو دەنگەت قوتی رووحم بوو
لەتۆ فانی خەم کەشتی نوحم بوو

یاخودا رەقیب قەت نەسێتەوە
لەئاگر نەبێ جێی نەبێتەوە
گرتەی خودابێ قەت نەکرێتەوە

هەرچەندی سامی لەخەونی شەوان
خەلاسی نابێ لەدەستی ئەوان

* * *

با بەدڵ بڵێن ئەعوذوبیللا
ـە ئیشو کارمان بڵێن بسمیللا
نەصرەت وەردەگرین وەڵلا وەبیللا

هەرچی وانەبێ ئەعوذوبیللا
ناگا بە مەقسەد حاشا وەلیللا

هەرچی کەبوبێ بەخوا مردووە،
وەختێک دەبینی کەوا زندووە
بەعزێک دودڵن هەر دەڵێن کوا

کەینێ خوا فرموی بێ دەنگو زووە
ئەوا ئایەتی بۆ سادیربووە

هاوار سەد هاوار بۆ شەخسی دوڕو
لەقیامەت ئەڵێ ئەو ڕۆژە خۆ بوو
ئەمن وەحشی بوم ئومێدم نەبو

گوێی خۆم نەدایێ ئەوەی خوا فەرموو
کە فەرمووی زالیکەل یەو مولحەقوو

بیللا ئەو رۆژە کەڕاستەو دەبی
خودای ناردین هەزاران نەبی
پاکیان پیَ گوتین چی بوبیو دەبی،

ڕێگای ڕاستیان گۆکەس بزرنەبی
واڕێگا دەرکەوت کەس کور نەبی

خۆ من واز ناینم لەخاڵقی خۆم
بەخۆم دەزانم بەخوا هەر دەڕۆم
هەموو سەروەتی ئەمریکان و ڕۆم

مولکی بەریتانی باوی بە ئەستۆم
من هەر فەقیرو کە موحتاجی تۆم

خودای نەدیدەم ئەمن ناوێرم
چەند شت لەدڵدا بەتۆی دەسپێرم
هەرچەندی برسیم بەچاو هەر تێرم

هەرچەند فەقیرو بیَ خێرو بێرم
ئوممەتی فەخرم بەچەشنی شێرم

گـــــرتنی ڕێگـــــای ڕاســــــت بـــــۆ ئێمەیـــــــە
چـــــونكی لــــــە قورئـــــان ئیـــــشارەت هەیـــــە
لـــــــەپاش ناخۆشـــــــی کەخۆشـــــــی هەیـــــــە

نەفـــــــسی ئایەتـــــــە بـــــــێ هەوەنتەیـــــــــە
کـــــەوا ئایـــــــەتی عوســــــــری یوســــــــرەیە

چـــــاترین کەســــێ کــــــە هـــــات بـــــۆ وجـــــود
وەك دەكـــــــــەن شـــــــوكر واحیـــــــــدو وەدود
دەژیـــــــن لـــــــە دنیـــــا بەپـــــــشتی مـــــــەعبود

جەیـــــشی تەپۆیـــــە شـــــرطــــەی عەنكـــــەبود
بـــــڕوای پـــــێ دەكـــــەن مەســـــیحی و یـــــەهود

ئـــــەی خـــــوا پەرســـــتان وەرنـــــە نەدامـــــەت
هەرچـــــــی بكـــــاتن نوێـــــژو ئیقامـــــەت
یـــــا بڵـــــێ شـــــێخم صـــــاحیب كەرامـــــەت

بـــــــەدیاری دەخـــــا ڕۆژی قیامـــــــەت
خـــــوا بـــــو خـــــوا بـــــو یـــــا بـــــۆ زەعامـــــەت

سـەری حیکمەتان لـەخوا ترسانە،
لـەخوا ترسەکان سـامیان گرانـە
چـونکە ڕێگایـان، ڕێگـای ئینسانە،

نـەمیم و حەسـود حیزبـی شـەیتانە
ڕێگـای خواپەرسـت ڕێگـای قورئانـە

## لەری ی یەکیتیی میللەتەکەم

قــــەلبی مــــن گـــەر چەشـــنی لالــــە بێتونـــەوتی تـــیٚ بکـــەن
ئـــاگری دوژمـــــن بێتـــەگیانم وەك چـــرا مـــن پـــیٚ بکـــەن
شەقـشەقی کــەن گۆشــتو ئێـسقان یــەك بەیــەك خێــی تێبکــەن

بـــیٚ تـــرس مـــن دێمـــە مەیـــدان حوکمـــە ئـــازادیم دەویٚ
گـــەر نەســـووتێمو نـــەخنکێم چـــۆن هـــەژارم ســـەرکەویٚ

نەچـــمە نـــاو جـــەرگی هـــەژاران شانبەشـــانی وەك بـــرا
روحـــو لاشـــەم ئـــیش نـــەکا بـــۆ میللـــەتێکی حـــەق خـــورا
بەوشـــەوی پـــڕ ترســـووتاریك مـــن نەســـووتێم وەك چـــرا

کۆمـــەڵی دامـــای هـــەژاران چـــۆن دەبیـــنن بـــچنە پـــێش
لـــێم گـــەرێن مـــن بـــا بســـوتێم ببمـــە خـــاكو خۆڵـــەمێش

ببمـــــەخاکو خۆڵـــــەمیش بـــا تـــا هـــــەژارم پـــیٚ بگـــا
بـــا بـــــسووتێم بەڵکـــە گـــەنجو لاوەکـــانم تـــیٚ بگـــا
بێتـــە مەیـــدان خـــوێن برێـــژیٚ تاحـــەقی خـــۆی پـــیٚ بگـــا

تـــا بزانـــیٚ غـــەرقی خوێنـــە کـــیٚ حـــەقی وی خـــواردووە
بالـــە بۆحـــەق خـــوێن برێـــژیٚ دەرچـــیٚ دوژمـــن تـــا زووە

تـــا لـــەناو میللـــەت نـــەمینیٚ فیکـــری ئینـــسانی دەنـــی
نـــەك لـــەناو میٚـــشك بمـــینیٚ ببتـــە مـــاددەی بۆگـــەنی
شـــەعبی چـــاکی پـــیٚ نـــەخۆش بـــیٚ بیٚتـــە حـــالٚی مردەنـــی

خۆشـــە مـــردن بـــۆ بـــەلاٚی وا هـــیچ و پـــووچ وپـــڕ خەتـــەر
نـــەك بـــژی عامیـــل بەبرســـی و روتـــو قـــووتی و دەردەســـەر

(ســـامی) قوربـــانی گـــەلت بـــە قـــەت مـــەژی بـــەو زیللەتـــە
هەرکەســـــیٚ بمـــــریٚ لـــــەریٚگای نیـــــشتمان و میللەتـــــە
نـــامریٚ هـــــەرگیز دەمـــــینیٚ چـــــونکی خـــــاوەن غیرەتـــــە

خـــۆت بـــەقوربانی گـــەلت کـــە فـــەرزە قوربـــانی لـــەبۆ
نیـــشتمانی حـــوڕو سەربەســـت ئومـــەتیٚکی ســـەربەخۆ

# وایـــــــه

لاوی کـــــورد قوربـــــانی دەربـــــیٚ شۆڕشـــــیٚ بـــــەرپیٚ دەکـــــا
کـــاتیٚ تاریــــك بـــوون لـــەرێی گــــەل وەك چـــراخۆی پـــیٚ دەکـــا
رۆڵـــە رێـــی ئـــازادی میللـــەت خـــوێن دیٚ پرســـی پـــیٚ دەکـــا

پێـــی دەڵـــیٚ مـــن ئـــاوی داری حـــوڕو ئازادیمـــە هـــەر
شـــین بکـــەم لـــەو نیـــشتمانەی بـــۆ هـــەزاران بێتـــە بـــەر

داریٚ ئاوبـــــدریٚ بـــــەخوێنیٚ بێـــــشکە هـــــەر بـــــەردەدا
هـــەر بەخوێنـــە دوژمـــنی گـــەل دەســـت لـــەخاکت بـــەردەدا
فاشـــی دیٚ گـــەر خـــوێن نەرێـــژی ئـــاگرت تـــیٚ بـــەردەدا

خـــوێن و تێکۆشـــان نـــەبیٚ لات دەبیـــە رووتـــو دەربـــەدەر
فـــەرقی کـــانی نێـــرە یـــا مـــیٚ شـــێر لـــەلانیٚ بێتـــە دەر

خـــوێنی ســـورت گـــەر نەرێـــژی یـــا لەبەنـــدو هەنـــدەران
دەبنـــە عەبـــدی خوێنمـــژان و دیلـــی دەســـتی نۆکـــەران
جـــا بـــەهێزو خـــوێنی ســـورت هـــەروە شـــاخ و ســـەنگەران

ببیـــە لاوێکـــی بـــە(ســـام) بۆکـــوردی مـــەردی پـــڕ هونـــەر
بـــۆ هـــەزاران خـــوێن برێـــژە تـــاجی ژینـــت بێتـــە ســـەر

## پێنج خشتەکی (سامی)
## لەسەر شیعری قوباد جەلی زادەی شاعیری لاو

قــــەڵای (غەمـــدان)و کوێـــستانو هـــەواری نەوبـــەهار هیـــچە
ئەگـــەر خـــارای قەرەیـــدوون بـــێ لـــەئاڵتوونیش دەوار هیـــچە
تـــــەڵاوو گەوهـــــەرو دوڕی جیهـــــان بـــــابێ بـــــەبار هیـــــچە

((کـــەتۆم یـــار بـــی عـــەزیزی مـــن هـــەزارو یـــەك نـــەیار هیـــچە
لەراســـت زەبـــری تفـــەنگێکا ڕمـــاحی بـــێ ژمـــار هیـــچە))

ئـــــەتۆ نـــــازانی ئـــــەو یـــــارە چ شـــــیرینو چ یارێکـــــە
چ بـــــاڵا بـــــەرزو قـــــەدباریك، بـــــەنازو چـــــاوخومارێکە
کـــە بـــۆی عـــەتری هەناســـەی بـــێ هـــەتامردن بەجارێکـــە

((بـــەهاری رووی بـــەهادارت بەچـــوار فەســـڵە بەهارێکـــە
لـــەلای بـــاخو گوڵـــستانی وەنەوشـــەو لالـــەزار هیـــچە))

لـــەبێ مـــەیلیت لـــەناڵینو لەدانـــەی خـــاڵو نـــاوداوم
بـــەئاگری عیـــشقی تـــۆ جانـــە لەچـــەیوانت کـــە ســـووتاوم
بەخۆشـــت بـــاش کـــەدەیزانی هـــەموو عـــومرت بـــەباداوم

((کـەمن ئـەم دەنگـە ناسـکەی تـۆم لەبـەرگوێ بـێ چـرای چـاوم
چ حاجـــەت ســـۆزی موســـیقا، کـــەمانو عـــودو تـــار هیـــچە))

بەپێـــچەی مـــەکرو زوڵفانـــت لـــە مـــن دووبـــارە داپۆشـــە
دڵـــی مـــن تـــۆی لـــەناو دایـــە لـــەناو قوڵپـــەی گــڕو جۆشـــە
بەهەشـــتو بـاخی نـــەمردوودی، بـــە بـــێ تـــۆ بـــێ لـــەلام بۆشـــە

((ئەگـــەر سـیروانێ هەڵبەسـتم بـەئاوی چـاو لـەلام خۆشـە
کەچـۆن مەعلوومـە دڵـداری بـەبێ گریـانو زار هیـچە))

لـــەبۆ کوشـــتن چ بـــێ رەحمـــە، چ غـــەددارو چ بـــێ باکـــە
ئـــەوا کوشـــتن ئەنیـــسیتی، بـــەرووی رۆژی کەروونـاکـــە
لـــەبرۆای تـــۆ کەعاشـــق هـــەر بناڵێنـــێ وەهـــا چـــاکە

((کـەزی ئیشکـچی مەمکۆڵـەت لەمـەو بـەدوا لـەبۆ ناکـا
کـەزانی عاشـقی شـەیدا، رقو خـەوفی لـەمار هیـچە))

خەزێنـــەی حوســـنی تـــۆ گیانـــە دڵو بـــیری ئـــەوا ســـەندە
کـــزەی کـــەیفو وەفـــاداری بـــەدوو لێـــوو دەمو خەنـــدە،
لـە((سـامی)) گـەردەنو مـل وەك خۆتـەن خـوانو سـەمەرقەندە

(دڵـــی زاری (جـــەلی زادە) بەئەگریجـــەت وەهـــا بەنـــدە
تـەمای بـۆ سـەرفیرازبوونو ئومێـدی بـۆ قوتـار هیـچیە!))

دڵـــــــم دەنـــــــــاڵی زۆر بەحـــــــــەزینی
جـــــــارێکی نــــــــەبو چـــــــاوان هــــــــەڵێنی
بۆکوشـــــــــتنی مـــــــن پەرچـــــــەم دەژێنـــــــــی

دەرمـــــــــانی دەردی دڵـــــــــی غـــــــــەمگینی
وەك پـــــــەلکو خونـــــــچەی گـــــــوڵ یاســـــــەمینی

# ئەی مانگ

چۆن راوەستاوی لە بۆشی ئاسمان
رۆژو شەو لەرێی سوڕان و دەوران
لەدەوری زەوی لەبن ئەستێران

بۆ وا بێ هۆش و بێ دەنگ و ماتی
هەر دێوەچی بێ وەعدەو کاتی

لەوهات و چونە نیشانت چییە
ئەتۆ چت دەوێ مەرامت چییە
پەروەردگارو خودانت چییە

بۆ بێ هۆش و بێ دەنگ و ماتی
هەردێو دەچی بێ وەعدەو کاتی

بێ دەست و زمان بەکەس ناوەستی
ناحەسێیتەوە دەمێ ناوەستی
بیرو بڕواکەت بابێ ڕاوەستی

بۆ وا بێ هۆش و بێ دەنگ و ماتی
هەر دێوەچی بێ وەعدەو کاتی

بۆچـــی پـــێم نـــاڵێی یـــادی چـــیت هەیـــە
لـــە کـــێ دەترســـی ســـامی چـــیت هەیـــە
لـــەو کائیناتـــە کـــانی چـــیت هەیـــە

بـــۆ وا بـــێ هـــۆش‌و بـــێ دەنـــگ‌و مـــاتی
هـــەردێو دەچـــی بـــێ وەعـــدەو کـــاتی

# رۆڵـــــه

تـــۆ مەبـــە پیـــاوی ئـــەمو ئـــەو گـــەل فرۆشـــی قـــەت مەکـــە
رێگـــــری ژیـــانی هـــــەژارو حەلقـــە گۆشـــــی قـــەت مەکـــە
بـیری مـــردن لـــەو گەلـــەی خـــۆت یـــان نەخۆشـــی قـــەت مەکـــە

هەرکەســـێ کۆسـپەی لـەرێگای میللـەتی خـۆی دادەنـێ
غـەیری تـف بێـشك لـە مێـژوو هیـچی دیکـەی نـادەنێ

عەیبـــە سەرشــــۆڕکەی بـــەدینار لاوی تــــازەی نەوجـــەوان
تـــۆی لـــە شـــاخی نیـــشتمان دا بـــۆ شـــەبەی خـــونی شـــەوان
نـــەك لـــەرێ ی بێگانـــە جاســـوس ببیـــە خـــوبزەو پاســـەوان

مـــــەردی میراتـــە لـــەکوردان وا لـــەبۆ تـــۆ مایتـــەوە
قـەت شـەرم ناکـەی کـە کـوردی بۆچـی پاڵـت دایتـەوە

بـــۆ ســـەرت ســـوڕماوە رۆڵـــە کـــەس کەســـێکی کـــەس نییـــە
هەرقـــسەی گـــەورەی بـــە بـــێ کـــار نابتـــە مایـــەو بـــەس نییـــە
خـــوێنی لاشـــەی خـــۆت نـــەبێ تـــۆ هـــیچ کەســـت دەربـــەس نییـــە

بـــۆ هـــەژاری و دیلـــی خـــەڵقی کـــەس حـــەقت ناداتـــەوە
خـــوێن کلیلـــی دەرکـــی زوڵمـــە کـــەس نییـــە لێـــت کاتـــەوە

خـــوێنی چـــینی خـــوێن رێژینـــه خـــوێن لەچـــاو دەســـڕێتەوە
ئـــــەو لەمێـــــژوو زۆر بەنرخــــەو ژیـــــانی پـــــێ دەکرێتـــــەوە
هــــەر بەخوێنـــە شــــەڕ لــــە ناوچـــوون بیکــــوژێ‌و ببڕێتـــەوە

ســولحی گــشتی بێتــه کایــەو ژیــنی رۆژئـاوا و هــەلات
هێمنـــی داری بەریـــداو ژیـــنی هاوبـــەش بـــۆ خـــەلات

بـــۆ خـــەبات ناکـــەی لـــەبۆ ژیـــن بێیـــە رێـــزەی میللـــەتان
ببیـــە هاوبـــەش بـــۆ گـــەڕانی شـــاخ‌و دەریـــای نـــاو جیهـــان
وا وەکـــو مورغـــان دەســـوڕێن دەچـــنە نـــاو ئەســـتێرەکان

رۆڵــه بۆچـی وا بــەبیٚ(سـام) پــەردەت لــەڕوت دادایتــەوە
بـــیری دوژمـــن وا لەشـــاخ‌و مـــاڵ‌و مێـــشکان مایتـــەوە

* * *

ئـــــــەو ئەرزەکـــــــە فـــــــاخیرە خومـــــــۆلکێکی خودایـــــــە
فەرشـــــی بەشـــــەرە مەعـــــدەنی پڕچـــــەتری ســـــەمایە
کەوکـــــەبی تەســـــبیحە بـــــەلا ڕۆژیـــــشی چـــــرایە

مـــــەخلوقی ســـــەری لەهـــــەواو کـــــەیفو ســـــەفایە
قیـــسمێکی حـــەیاتی نییـــە تـــا ڕوحـــی قەزایـــە

ئادەم و ئیدریس و صالح و نوحە لەوێیە
خدرو صاحێبی یەدی بەیزا کە لەوێیە
عوزێرو یونس و ئیزحاقە لەوێیە

سەییدی ئینس و جنن و مەلائیك کەلەوێیە
کەعبەو جەبەلی قودسە وەهەم توری سینایە

مەزرەعەیی ئاخیرە بۆ یارانی وەفادار
هەستن لەخەوی غەفڵەتو ئەی ئادەمی هاوار
خوێن رێژی لەبۆ موشریك وخوێن رێژی ریاکار

مانعە خالق یادی بکە هەر نەبی جارجار
هەرچی کە ئەکەین حەفیزە هەتا رۆژی جەزایە

شەمس و قەمەرو کەوکەب و ئەو ئەرزی بەبوڕکان
وەك دەهەژێ لەو ڕۆژی کە جەولانە لە بەحران
ئینزارە لەبۆ جنن و بەشەر بۆ هەموو حەیوان

بێ سودە گرین و جەزەع وەڵلاهی بەقوڕئان
ئەو نەفسە بەدە ڕۆیی بڵێن کاری کرایە

خالقــــه بـــــۆجنو بەشــــەر بـــــۆ زەڕڕەیـــــی مــــسقاڵ
بـــی نـــۆرە لــــەبۆ حـــەزرەتی کـــرد شـــەرتە بـــۆ جالجـــال
ئـــەو وەختـــە کـــە مەعلومـــە لـــەخوا ئوممـــەتی بـــێ حـــاڵ

وێرانـــــە ئـــــەرز بـــــەنزولی ئایــــەتی زیلـــــزال
هـــاوارە بـــە حـــاڵی منـــی وەك نیمـــە بەقایـــە

ئـــــەو نفـــسە بـــەدە موســــتەحەقی ئـــاگرو عەزابــــە
غافڵمەبـــــە بۆخـــــۆ لەبــــەینی خەوفوڕجابـــــــە
دائـــــیم لـــــــەفکرکردنی ئـــــــەحکامی خودابـــــــە

تـــۆدوری بـــوغزو حەســـەدو دوڕوویـــی ڕیایـــە
ئینعـــامو کـــەرەم مەرحەمـــەتو ڕەحمـــی لەلایـــە

ســــانعی ئینــــسانوجنو حەیوانـــــە بـــــــەملیار
مـــــەخلوقی هەیــــە بەلاکــــە پــــێم نایەتــــە ئــــەژمار
بـــــەعزێ ئەزیـــــەتو غـــــەم هەردەمـــــە فکـــری لـــــەئازار

مەخـــسودی کەســـەترە دەیـــەوێ ڕوویـــی لەســـتتار
ڕوڕەشـــە چـــونکی لـــە دنیـــا بـــێ حەمـــدو ســـەنایە

واباشە بەشەر بژیی لەسەر وەسیەتی لوقمان
ئەوکەسی تەختی هەیە ئەو مەشهورە بەسوڵتان
زیخی عەدل هەڵخا وەکو داودو سولیمان

زیللەتی میللەت لابەرێ وەکو یوسفی کەنعان
بێ چارەیە ئینسان لەکەری ڕووی لەهەوایە

ئەی نفسە بەسە توبی خودا روکە نەدامەت
بێ عوزرو بەهانەی بەخودا رۆژی قیامەت
عالەمو ئومەت حەزرەتی شێخی بەکەرامەت

دەردەکەوێ مەخسەدی خوا بو یاخو زەعامەت
دەفتەری ئەعمالی دەدەنێ و وەختی سەرایە

ئەی ئەرزە کە مەشهوری بە گەورەو کەبەرینی
میوانە لەلا فەخری عەرەب شاهی مەدینی
ئالوسەحابو شوهەداوو خوێنی برینی

مژەیی حەشرە بەشەر لەیەکەم خەبەرینی
چ تونەو چ تیژە دەبینن کە چ هەرایە

ئەو رۆژە دەهەژێ بەدەنو جەرگو هەناوت
بێ کەڵکە گرینو جەزەعو وا ئەشکی بەتاوت
بۆخۆت بگری هەتاکو خوێن دێ لە هەردوچاوت

وەرە پێش بەخۆتو دیوانت سامییە ناوت
شیعرو کەلامت حازرو مەوجودە کەمایە

* * *

ئەلیاسو خدرو صالحو داوودو سولێمان
یەعقوبو عوزێرو مەسیحو یوسفو کەنعان
یەحیاو ئەسکەندەرو زەلکفلو حەزرەتی لوقمان

شاهانی زکرکردنی مەعلومە لە قورئان
وا لەبۆ خاتری حەزرەتی لۆلاکە بە بورهان

دەنگی سەیدی جنو بەشەر دێ لە مەدینە
بۆدینی خوداوەندی تەعالا کە ئامینە
مژدەیی نەصری لەدەستە بۆرەجمی لەعینە

بەدکاری نەکەین لەنەمیمی بۆچی چەقینە
خانەیی نەممامی ببینن وادەبێ وێران

نەو زاڵمی توشی عەزاب و قەهری خودابوون
صاحبی عیزو سەڵتەنەتی باغی سەبابوون
بەقەهری خوداوەندی عەزیم گشتی فەنابوون

وا بەتەجبور ڕو لەدەری داری بەقابوون
شابەهمەن و تەیمور بەختەکو قەیسەری توران

هەرچی لەدینی حەزرەتی فەخرولعەرەبیبی
قەت نابێ لەناوبەرگی زوڵم داو غەزەبیبی
دوشمنی ئەڵلایە یەقین هەرچی کە نەبیبی

مەعلومە لە شەیتانە کە هەرچی عەسەبیبی
لەغەلغەلەدا خالی دەبی هەینێ لەئیمان

حەقە هەر خۆم و لەبۆ خۆم ڕوبکەمە زاری
بۆ ڕۆژی فەرمویەتی قورئان و عەدەی باری
قەهری غەزەبی خوا دێ وەك بارانی بەهاری

نەمامی ببین لەدڵی ڕونی بوخاری
ئیسپاتی نەمیمی کە دەکاو کومەڵی مەروان

بەسیە غروری ڕوو لەهەواو حوبی جیهانی
قەهری غەزەبی وەستاوە هەتا نەخفەی سانی
مەیلی حەقیقەت بکە تا لەو عومری جەوانی

تۆ حەسەناتت بێنە لەبۆم پێم بڵێ کانی
بۆ ڕۆژی کەوا خێروشەڕت وەزنە بە میزان

هەر صاحێبی ئیمانی سەحیح ئەهلی نەعیمە
ئەو دڵی پڕ حەسەدوشکە خەڵقی جەحیمە
ئەو لەعنەت لەسەرە کە دەخوا ماڵی یەتیمە

ئیسلامی سەحیح کە دەڵێ لەو پەندە بەریمە
دڵی ئەوکەس عەرشی خودایە دورە لە شیتان

وەسفی بەچاکی ئیختیاری خوداوەندی عەزیمە
بێ بابو وەلەد قادرو قەیومو قەدیمە
بەننایی ئەرزو جننو بەشەر عەرشی عەزیمە

ڕاحیمو ڕەحمانو سەخی جەنناتو نەدیمە
بۆئەوە بەخشینی لە جەننەت حۆریی و غیلمان

ئـــــەو ژیـــــانی کـــــە دەژیـــــی مردنیـــــشی بـــــۆ هەیـــــە
وەختـــــی ژینـــــت دەبینـــــی ئاخریـــــشی بـــــۆ هەیـــــە
جەننـــــەتو دۆزەخ تـــــەمام حەشـــــرو میـــــزان بـــــۆ مەیـــــە

بـــەس بگریـــێ ســـامییە رێـــی نەدامـــەت تۆبەیـــە
روت لـــەخوا وەرمـــەگێرە رو لـــە ئـــەو بکـــە ئـــەی جـــەوان

* * *

## تـــاك

صـــــاحبی هـــــادی، جـــــەللادی عـــــادی
فیـــــسقو فەســـــادی دەبێتـــــە شـــــادی

* * *

ئەگـــەر بـــەمن ڕازینـــە مایـــەی خوشـــی زانینـــە
دەزانـــی ژیـــانی ئینـــسانی نـــەزانی بزانـــی ڕەزانـــی

* * *

سەرشـــۆڕ و کالـــەك دڕاو برســـیو نـــان و دۆبـــڕاو
هـــەر لەپـــەناو پێـــچانو یـــان بـــیرو بڕواکـــڕاو



سامی عەودالّ لەکاتی خوێندنەوەی شیعردا




**د. کەمال مەعروف**



پەیکەری (سامی عەودالّ) لەبەردەم کتێبخانەی گشتی کۆیە



وێنەی (کۆیە) لەسەردەمی سامی عەودالّدا



د. کەمال مەعروف و سامی عەودالّ



د. کەمال مەعروف و سامی عەودالّ (١٩٧٥/٢/١٣) کۆیە



باخچەی ماڵی (سامی عەودال)



ژووری سامی عەودالی شاعیر



مەلا زاهیر کوڕی سامی عەودالّ

## قەلبی من گەر چەشنی لالە

## بەدەست خەتی شاعیر



# یەکەم شیعری شاعیر

## ببینی وەسفی ناتانی

## بەدەست خەتی شاعیر



## مەکەن مەنعم بەریسوایی
## بەدەست خەتی شاعیر



# ناوەڕۆكی دیوانی (سامی عەودالْ) بەپێی بڕگەو لاپەڕەكان

| ژ | (نیوه دێری) یەکەمی شیعر | برگە | لاپەڕە |
|---|---|---|---|
| ١٥٩ | بینایی ئەزەل سنعەتی وادیارە لەپێش چاو | چواردە برگەیە | ١٦٦ |
| ١٦٠ | موژدەت لێ بێ یائامینە حەملت موحەمەد ئەمینە | شانزە برگەیە | ١٦٦ |
| ١٦١ | چەندی واعیزبو بۆجانی بنی جانی | دە برگەیە | ١٦٧ |
| ١٦٢ | لە قورئانی کەریما ئایەتێکت پێ فەرموویین | چواردە برگەیە | ١٦٨ |
| ١٦٣ | شرك زوڵمی عەزیمە خەتەر ماڵی یەتیمە | چواردە برگەیە | ١٦٨ |
| ١٦٤ | لە سنعەتی ئەرزتو ئینسانی ئەو جەوانت | چواردە برگەیە | ١٦٩ |
| ١٦٥ | ئایەتە قەلەم سەروەت‌و سامانی محەمەد | چواردە برگەیە | ١٦٩ |
| ١٦٦ | لەو دەقیقەی هاتە دنیا حەزرەتی فەخرولعەرەب | پانزە برگەیە | ١٧٠ |
| ١٦٧ | وەسوەسەیی شەیتانی وەسوەسێکی زەعیفە | چواردە برگەیە | ١٧١ |
| ١٦٨ | جەللادی بت‌و ئەصنام چەند سەفەر چوو لەبۆ شام | چواردە برگەیە | ١٧٢ |
| ١٦٩ | بڵێ ئەو خوایەی پێویستە بوونی | دە برگەیە | ١٧٢ |
| ١٧٠ | بێ حەسیرو بێ بالین لەبۆ لەیلا بناڵین | چواردە برگەیە | ١٧٣ |
| ١٧١ | ئەوا حەدیسی قاتیل‌و مەقتوول | دە برگەیە | ١٧٤ |
| ١٧٢ | شەهسواری دو جیهان‌و شەهسواری مەحشەری | پانزە برگەیە | ١٧٥ |
| ١٧٣ | من غەمم هەرگیز غەماوی کارو پیشەم هەر غەمە | پانزە برگەیە | ١٧٦ |
| ١٧٤ | ئەو ئەرزە کە فاخیرە خۆمولکێکی خودایە | چواردە برگەیە | ١٧٦ |
| ١٧٥ | شاهانی زیکر کردنی مەعلومە لە قورئان | چواردە برگەیە | ١٧٧ |

| ژ | (نیوە دێڕی) یەکەمی شیعر | برگە | لاپەڕە |
|---|---|---|---|
| ٢٥٠ | لەداخی تۆ من مەجنونم شەو ناڵین و ڕۆژ زەبوونم | شانزە برگەیە | ٢٢٨ |
| ٢٥١ | حەسرەتی دوری فیراقت خۆم دەخۆم دڵخولزمە | پازدە برگەیە | ٢٢٩ |
| ٢٥٢ | غەم بخۆم بۆ دڵ کەڕۆیی کەوتە چۆڵ و شاخەکان | پازدە برگەیە | ٢٣٠ |
| ٢٥٣ | لەو حوسنە ئەمن موستەحقی لوتف و زەکاتم | چواردە برگەیە | ٢٣٠ |
| ٢٥٤ | لەشکری زوڵفت بەچین چین دێتە سەحرای ڕوومەتی | پازدە برگەیە | ٢٣١ |
| ٢٥٥ | ئیسلامە حەقیقەت بە ئەسڵ شافیعی مەزهەب | چواردە برگەیە | ٢٣٢ |
| ٢٥٦ | وا زوڵفی دەڕژێ لەو دەمی دێ بایی شەماڵ | چواردە برگەیە | ٢٣٢ |
| ٢٥٧ | تەبیب دەردم زۆر گرانە چاری ناکرێ بێ دەرمانە | شانزە برگەیە | ٢٣٣ |
| ٢٥٨ | کەسێ ببینێ ئەو شۆخە وەکو ئاهو لەسەحرادا | شانزە برگەیە | ٢٣٣ |
| ٢٥٩ | وەرە یارم وەرە یارم بە موژگانت بریندارم | شانزە برگەیە | ٢٣٤ |
| ٢٦٠ | ئەو شۆخە دێ پەرچەم چینە بۆ باغی دێ بۆ گوڵ چینە | شانزە برگەیە | ٢٣٤ |
| ٢٦١ | کارو پیشەم هەر گریانە | هەشت برگەیە | ٢٣٥ |
| ٢٦٢ | بێ هەواری و حەسرەت کێشان | هەشت برگەیە | ٢٣٥ |
| ٢٦٣ | تۆی حەبیبم تۆی عەزیزی | هەشت برگەیە | ٢٣٦ |
| ٢٦٤ | جارێ ناپرسی من بۆزاریمە | دە برگەیە | ٢٣٧ |
| ٢٦٥ | موحیبەت دەردێکی پیسە مەڵێن کارێکی هاسانە | شانزە برگەیە | ٢٣٨ |
| ٢٦٦ | وا سەدای بولبول لەباغان کاری ناڵەو شیوەنە | پازدە برگەیە | ٢٣٨ |
| ٢٦٧ | لە هیجری تۆیە دڵم شێواوە | دە برگەیە | ٢٣٩ |
| ٢٦٨ | لەتاوی لەیلا سینە بریانم | دە برگەیە | ٢٤٠ |
| ٢٦٩ | چەند بەنازە کە دەڕوا شۆخ و شەنگ و شیرینە | شانزە برگەیە | ٢٤١ |
| ٢٧٠ | کۆتری دەڕواو دەلەنگی حەلقەیی خڕخاڵەکەی | پازدە برگەیە | ٢٤١ |

| ژ | ( نیوه دێری ) یەکەمی شیعر | بڕگە | لاپەڕە |
|---|---|---|---|
| ٣١٣ | بەو ئەگریجەی داو بەداوە بۆ تۆیە جەرگم سووتاوە | شانزە بڕگەیە | ٢٦٨ |
| ٣١٤ | بۆ فریبی عاشقان وجەزبی دڵ وا ماهیری | پازدە بڕگەیە | ٢٦٩ |
| ٣١٥ | ئەگریجەیی داو داوەلەسەر رووومەتی ئاڵی | چواردە بڕگەیە | ٢٦٩ |
| ٣١٦ | بالآیی شلو زوڵفی پڕلزت وامەژێنە | چواردە بڕگەیە | ٢٧٠ |
| ٣١٧ | کراسەکەی کتانە سوخمە لەسەر مەمانی | چواردە بڕگەیە | ٢٧٠ |
| ٣١٨ | مەکەن مەنعم بەڕیسوایی ڕەفیقانی وەفادارم | شانزە بڕگەیە | ٢٧١ |
| ٣١٩ | کراسەکەت کتانە هەرچەند کە چاوت جوانە | چواردە بڕگەیە | ٢٧٢ |
| ٣٢٠ | وەك کۆتری ناو لیمە کە دەڕوا بە گرانی | چواردە بڕگەیە | ٢٧٣ |
| ٣٢١ | لەسەر خورشیدی روخساری نیقابی زوڵفی لاداوە | شانزە بڕگەیە | ٢٧٤ |
| ٣٢٢ | میوانی باغەوانیم تاسەحەر پاسەوانی | چواردە بڕگەیە | ٢٧٤ |
| ٣٢٣ | ئەی حەبیبە ئینتیزارم هەدیەیی تۆ بۆ نەهات | پازدە بڕگەیە | ٢٧٥ |
| ٣٢٤ | من بەچەشنی بولبولان دەچریکێنم بۆ گوڵان | چواردە بڕگەیە | ٢٧٥ |
| ٣٢٥ | وەك دڵی منت ڕەنجەڕۆ کرد یاخوا کۆست کەوێ | پازدە بڕگەیە | ٢٧٦ |
| ٣٢٦ | چاوت هەڵێنە لەیلەی مەسیحە | دە بڕگەیە | ٢٧٧ |
| ٣٢٧ | بۆ وابێ ڕەحمی زاڵم دەشکێنی پەڕو باڵم | چواردە بڕگەیە | ٢٧٧ |
| ٣٢٨ | بولبولێکم من لەباغی پاسەوانی خونچەمە | پازدە بڕگەیە | ٢٧٨ |
| ٣٢٩ | چەشمو نیگەهو دوندانو لەبۆ خونچە بەتەنگی | پازدە بڕگەیە | ٢٧٨ |
| ٣٣٠ | مژەکانی وەکو تیرە لەناو قەوسی دو ئەبرۆ | چواردەبڕگەیە | ٢٧٩ |

| ژ | ( نیوه دێری ) یەکەمی شیعر | برگە | لاپەڕە |
|---|---|---|---|
| ٣٩٠ | گەر بشمكوژی لەبیرم ناکەی | دە برگەیە | ٣٢٧ |
| ٣٩١ | ڕەنجی لەدەرت تاواوە لەمن کەبەباچوو | چواردە برگەیە | ٣٢٨ |
| ٣٩٢ | هەرچی لێم دێ سوچی خۆمو بیری خاوی خۆمە من | پازدە برگەیە | ٣٢٩ |
| ٣٩٣ | کەمن زەنگینی باڵاتم بەیادی مەستی شەو بۆمە | شانزە برگەیە | ٣٣٠ |
| ٣٩٤ | لەیادت بم لەیادت بم لەبەردڵو چاوانت بم | شانزە برگەیە | ٣٣١ |
| ٣٩٥ | چاوڕێی باڵاتم ئەی یار بێم بۆ باغییو ناو گوڵزار | شانزە برگەیە | ٣٣١ |
| ٣٩٦ | بەنەرمی گوتی ئەو یارە گوتی شوشەی دڵت کانی | شانزە برگەیە | ٣٣٢ |
| ٣٩٧ | دوو چاوی کاڵە سوخمەکەی شینە | دە برگەیە | ٣٣٢ |
| ٣٩٨ | ئەوەی ڕۆیی لەدەستم چوو ژیانی ناو بەهارانم | شانزە برگەیە | ٣٣٣ |
| ٣٩٩ | ڕۆژێکی نەبوو بیرم کاتەوە | دە برگەیە | ٣٣٤ |
| ٤٠٠ | خودایە چەندە پڕ خەم بوو لە دونیادا بەسەرهاتم | شانزە برگەیە | ٣٣٥ |
| ٤٠١ | هەروەکو ڕۆژی ڕووت ماوە لە گەردوون | یازەدە برگەیە | ٣٣٦ |
| ٤٠٢ | خۆشەویستەکەم شۆخی پەرچەم خاو | دە برگەیە | ٣٣٧ |
| ٤٠٣ | عیشق دەردێکی دژوارە بەساناى تێ مەگەن لاوان | شانزە برگەیە | ٣٣٧ |
| ٤٠٤ | باغی سینەم پێ کەرەم کەی گەر بفەرمووی بێمەوێ | پازدە برگەیە | ٣٣٨ |
| ٤٠٥ | لەمێژووی ژیان بهاوێ هەنگاو | دە برگەیە | ٣٣٩ |
| ٤٠٦ | دڵ مەخە داوی زوڵفان مەیخە دەردو هیجرانی | چواردە برگەیە | ٣٤٠ |
| ٤٠٧ | کچە گیانە زەمبی من کە سونازم | یازەدە برگەیە | ٣٤٠ |
| ٤٠٨ | کراسی کتان سوخمە ئاڵە | هەشت برگەیە | ٣٤١ |
| ٤٠٩ | جارەکی نەبو بیرم کاتەوە | دە برگەیە | ٣٤٢ |
| ٤١٠ | وا تێنەگەی کەمەستی ئاوی ئەو لێوەئاڵەم | چواردەبرگەیە | ٣٤٢ |

# ديوان الشاعر الكردي (سامي عودال)
# ١٩١٠ - ١٩٨٥

سامي عودال شاعر وطني قومي، فقد اتخذ الشاعر اشعاره خصوصا في ميدان الشعر القومي الاجتماعي نفس المسار الذي سلكه ابن مدينته الشهير الشاعر حاجي قادر كويي حيث صار من تلاميذ المدرسة الشعرية التي ارسى دعائمها حاجي قادر كويي.

الذي يتناول في اشعاره المضامين السياسية و الفلسفية والاجتماعية والدينية والشعر الغنائي فأشعاره ذات نفس قومي واجتماعي يتميز باستخدام اسلوب بسيط و سهل، ان اشعار سامي عودال تتميز كلها بحب الشاعر وتعلقه بوطنه وشعبه وظل يدعو شعبه باستمرار للعمل والنضال حتى تتحقق اهداف امته، فديوان الشاعر يتوزع على فصلين، الفصل الاول يتحدث عن حياة الشاعر سامي عودال، دور الشاعر في الشعر الكردي كما يدرس شكل قصائده الوزن والقافية، اللغة الشعرية، البلاغة والرباعيات والتخميس.

الفصل الثاني يتناول مواضيع عدة منها الشعر السياسي والشعر الاجتماعي، الشعر الفكري، شعر المقاومة، الشعر الغنائي و الشعر الديني..الخ.

وتتضمن هذه الدراسة من مقدمة مع ملخص باللغتين العربية والانكليزية.

# Sami Awdal's Divan

Sami Awdal is a nationalist and patriotic poet.
In his nationalist-social approach, he followed the steps of Haji Qadri Koye, the famous poet of his own city. He is one of the disciples of Koyes poetical school.
Awdal's poetry deals with the political, philosophical, social and religious topics cast in lyrical form. His poems are pregnant with national and social issues.
His style is simple and easy. His poetry is characterized with his deep love for his homeland and his people.
He, continuosly, calls his people for work and strife until achieving the goals.
This poetical works is divided into two chapters.
Chapter one, is about the poet's life, his role in Kurdish poetry. It also tackles the poetical form, metre, rhyme, the poetical style, rhetorics, quatrains and penta stitches.
Chapter two, is about the topics of Awdal's poetry, his political, social and resistance, lyrical and religious poetry. This study also consists of an introduction with abstracts in both Arabic and English